# وشەی پرشنگدار

بەشی هەرە گەورەی ئەو ئەرکانەی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست لە کۆڕی ناوخۆدا دوای شۆڕشی ١٧ – ٣٠ تەمووزی ١٩٦٨ ڕوو بە ڕوویان بووە ، وەکو جێگیر کردنی دەسەڵاتی شۆڕشگێرانەو سەرکردایەتی کردنی لە لایەن پارتییەوە و پتەوکردنی سەربەخۆیی سیاسی و سەربەخۆیی ئابووریو بە تایبەتی میللی کردنی کاروبارەکانی کۆمپانیای نەوتی عیراقو بەشی ئەمەریکاو هۆلەنداو کۆلبەنکیان لە کۆمپانیای نەوتی بەسراو جێبەجێ کردنی گۆڕانە دیموکراتیانەکانو لە سەر هەمووشیانەوە چارە سەرکردنی ئاشتی و دیموکراتییانەی مەسەلەی کوردو دامەزراندنی بەرەی پێشکەوتنخوازو گۆڕانە سۆشیالیستیو کۆمەڵایەتییەکانو بنیاتنانی لەشکرێکی شۆڕشگێڕی نەتەوەیی بەهێز ئەمانە هەمووی ئەرکی بەیەکەوە بەستراوو بە یەکداچوو لەگەڵ ئەرکە نەتەوەییەکاندا تێکەڵ بە یەکترینو .. هەر پێشکەوتنێك کە پارتی بەعسی عەرەبیی سۆشیالیست لەسەر ڕێگای جێبەجێ کردنی ئەم ئەرکانەدا بەدی دەهێنا توانای شۆڕش پتر دەکرد بۆ کارکردنە سەر دۆخی نەتەوەییو هەروەها شارەزاییش زیاتر دەکردو زیاتر دەستی بەرەڵا دەکرد لەسەر ڕێگای بەدی هێنانی ئەرکە نەتەوەییە ڕاستەوخۆکانیدا

ڕاپۆرتی سیاسی سەربە هەشتەمین
کۆنگرەی هەرێمایەتی
کانونی دووەمی ١٩٧٤




لەبیرەوەریی شۆڕشەکانی تەمووزی نەمردا
سڵاو و پیرۆزبایی گەرم ئاراستەی سەرکردایەتیی
حزب و شۆڕش و گەلی عیراقمان دەکەین

# لەم ژمارەیەدا



ڕۆشنبیری نوێ
گۆڤارێکی گشتی مانگانەیە
دەزگای ڕۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات
ناونیشان: دار الثقافة والنشر الكردية. ساحة الفلاح بغداد
تەلەفۆن: ٨٨٧٥٧٩٥ پێنج خەتە

سەرنووسەر وبەرێوەبەری گشتی
سعاد ادیب علي

جێگری سەرنووسەر
فائق جمیل علي

# دەقی وتارەکەی باوکی فەرماندە احمد حسن البکر بە بۆنەی جێژنەکانی تەمموزی نەمر

**بەناوی خوای گەورەو میهرەبانەوە**
**ئەی هاوولاتیانی خۆشەویست**
**ئەی رۆڵەکانی نەتەوەیَ عەرەبی بەرێز**

ئا لەم ساتەدا ئاهەنگ بەبیرەوەریەکی نیشتمانیو، نەتەوایەتی خۆشەویستەوە دەگێڕین .. ئەویش بیرەوەری شۆڕشە مەزنەکەی ١٧یَ تەمموزی سالی ١٩٦٨ـ ئەمڕۆکە . نیشانەیەکی دیار پێکدەهێنێت لە مێژووی گەل .. وڵاتو .. لە مێژووی نەتەوەکەماندا .. لە رۆژێکی وەك ئەمڕۆی .. پێش یازدە سال لەمەوبەر .. گەلی عیراقی سەر بڵند توانی کە پێی لەسەر رێگای دوارۆژێکی پڕشنگدار دابنێت کاتێ بەسەرکردایەتی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی شۆڕشە چاوەڕوان کراوەکەیَ بەرپاکرد .. وە بەرەو پێشکەوتنو سەربەستی و سەربڵندی بەباوەڕێکی تەواوەوە رێبازە سەرکەوتۆکەیدا کەوتە رەوت .. هەروەك بەسوربوونێکی تەواوەوە پێی نایە سەر رێگای تێکۆشانی نەتەوایەتی .. لەپێناوی یەکبوونو سەربەستیو سۆشیالیستیدا .. بەدرێژایی دەیان سال گەلی عیراقمان تێکۆشانێکی سەخت تێکۆشاوە .. پڕ لە قوربانیو ئازار.. شۆرشی کردو یەکەم شۆڕشی لەچەرخی نوێدا بەرپاکرد .. شۆڕشی بیست .. دوایی لە سالی ٤١یەدا شۆڕشی کرد .. وە بەدوای یەکدا چەند راپەرینێکی میللی لە چلەکانو پەنجاکاندا کرد .. دوایی لە چواردەی تەمموزدا شۆڕشی کرد .. وە لە چواردەی رەمەزاندا .. تێکۆشانی گەلەکەمان لە پێناوی ئامانجە نیشتمانیکانیدا تێکۆشانێکی ئازاو جوان بووە .. لەو تێکۆشانەدا بەهەزارانی لێ شەهید بووە.. وەبەدەیان هەزار تێکۆشەران تا لاوی بەندیخانەو گرتووخانەکانیان بینیووە ، بەهەموو جۆری چەوساندنەوەو نائومیدیەك .. گەل قوربانی دەداو .. ئازاری دەچەشت . بەلام ئەو هەوڵدانە شۆڕشگێڕیانەی بەرەودوا دەیدا بەنوچدان کۆتاییان دەهات .. چونکە بنەڕەتی سەرکەوتنیان نەبوو.

**● شۆڕش دەستکەوتی مەزن وەدی دەهێنێ .**

شۆڕشی ١٧ی تەمموزی سالی ١٩٦٨ بوە تەتویجێکی بێ وێنەی .. تێکۆشانی ئەم قوناغە درێژەی گەلەکەمان .. شۆڕشێکی پێگەیشتوو بوو .. وە کامل بوو .. ئەو عونسوری سەرکەوتنو بەردەوامی یەیَ بۆ ئامادە بوو کە هەوڵدانە شۆڕشگێڕێکانی تر نەیان بوو .. لەبەر ئەوە دەمانبینی پێش دەکەوت .. پەرەی دەساند .. هێزو گەشەکردنی سال بەدوای سالدا زیاتر دەبوو .. لەگەل ئەو هەموو پیلانانەی دەوری دەدا .. وە لە گەل ئەو هەموو سەختیەدا کە دەهاتە بەردەمی ..

شۆڕشەکەتان لە ماوەیَ ئەو یانزە سالەی رابوردووەدا .. دەستکەوتی مەزنی وەدی هێناوە کە سەرجەمی وڵاتو هەموو مەیدانێکی ژیانی گرتۆتەوە .

یەکەم دەستکەوتی مەزنی شۆڕش ئەوە بوو کاتێ توانی سەربەخۆیی تەواو بۆ وڵات وەدەست بهێنێ .. وە بە شێوەیەکی ببڕای ببڕ خواستی سەربەستی بۆ زامن بکات .. ئەمەش بەمەترسی ترینو وردترین کارە .. بەڵکو ئەو شەڕانەیە .. کە کردوویەتیو .. وئێستاش ئەو گەلانە دەیکەن کە لەوەوپێش دووچاری دەسەلاتی ئیستیعمار بوو بوون .

شۆڕشی تەمموز . بەسەرکردایەتی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی . لە سنووری سەربەخۆیی یەکی

رووکەشیدا رانەوەستاوە .

وە بەوە قایل نەبووە کە هیچ بەشێکی دەستە بەند بێ . هەر چەندێک بچووك بوو بێ .. لە ئیرادەی نیشتمانیو نەتەوایەتی .. ئەوە بوو عیراق لە سایەی شۆڕشو .. سەرکردایەتی مێژوویی بەعسدا بووە وڵاتێکی سەربەخۆی تەواو .. سەربەستی خواست دەتوانێت لە هەموو کاتێکدا بجولێت .. وە لە هەموو مەیدانێکدا .. وە مامەلە لەگەل هەموو هێزە نێودەولە دەکات .. لە بۆچوونی بڕیاری نیشتمانیو .. وە لە بەرژەوەندی نەتەوایەتی نەتەوەی عەرەبەوە ..

هەروەك شۆڕش ئامانجێکی نیشتمانیی گەورەی وەدی هێنا .. ئاواتێکی خۆشەویست بوو لە ئاواتەکانی گەلەکەمان کە ئەویش چەسپاندنی یەکێتیی نیشتمان بوو لە سەربنچینەیەکی نەبزێو .. کە هەلقولابی لە باوەڕو قەناعەتو پشتی بەستبێ بەبەیوەندیە ساغەکانی نێوان رۆلەکانی نیشتمانەوە .

هەروەك شۆرشەکەتان .. ئەی برایان .. وە بە هۆی خۆڕاگرتنو .. قوربانی دانتانەوە .. توانی وڵات لە دەسەلاتی بێگانە قوتار بکاتو . بنکەی ئابووری نیشتمانی دابمەزرێنێت .. گەلی عیراق .. ئێستاکە بەپێوانەی دۆخی پێش شۆڕش گوزەرانێکی باشدا دەژی ..وە لەبەردەم کەسانی عیراقیو لەبەردەم نیشتماندا توانایەکی بەوزە هەیە بۆ پێشکەوتنی ئابووری .. تا ئابووری عیراق وای لێهاتووە .. وە بەشایەتی هەموو لایەك .. زیاتر بەهێزو پەرەسەندووە لەنێوان هەموو وڵاتانی ناوچەکەدا .

وە لە سایەی شۆڕشدا .. عیراق قوناغێکی گەورەی بڕیووە لەڕێبازی زانیاریو رۆشنبیریدا . . خوێندن لە سەرجەمی وڵاتدا بلاوبۆتەوە . . وە واقیعی فێربوونی بەرزو زانستی کارسازی پەرەی ـ سەندووە .. وە هۆکانی رۆشنبیری بەهەموو جۆرەکانیەوە پەرەیسەندووە . . وە ئێستاکە بەگەرمی هەرەوەزێکی نیشتمانی قەلاچۆکردنی نەخوێندەواری لە ئارادایە .

وە لە عیراقی ئەمڕۆدا . . ملیونەها کەس لەژێر ئالای رێکخراوە میللیکاندان .. لە رێکخراوی تەلایعەوە کە نەوەی هەلچووی وڵات دەگرێتە چوار چێوەی خۆی تا وەکو هەموو چینو کارەکان .. وە هەموو تەمەنێک .(٥)

رۆلەکانی عیراق هەموویان خۆیان خستۆتە خزمەتی گوزاری نیشتمانەوە .. وە لە چوارچێوەی ئەم رێکخراوانەیانەوە خۆیان ئامادە دەکەن بۆ هەموو ئەرکێکی بنیاتنانو پێشکەوتنو . . ئەرکەکانی بەرگری لە نیشتمانو شۆڕش .

وە لە وڵاتی ئێمەدا .. بەدەیان هەزار لە رۆلەکانی گەل .. چەکیان بۆ پارێزگاری نیشتمانو شۆڕشو دەستکەوتە شۆرشگێڕیکان هەلگەتووە .. ئەویش لە چوارچێوەی سوپای میللیدا ..کە بەیەکێ لە دەستکەوتە شەنگەکانی شۆرش دادەنرێت ... وە بەلگەیەکە لە سەر بەتینی یەكگرتوویی شۆڕشو جەماوەرو . . ئامادەیی بێسنووری جەماوەر بۆ خۆبەختکردنو قوربانیدان لە سایەی شۆڕشو حزبە سەرکردەکەیدا .

## ● بنیاتنانی سوپای نیشتمانی .

شۆرش شانازی بەوەوە دەکات کە دەستکەوتێکی نیشتمانیو نەتەوەیی گەورەی بۆ وڵات وەدیهێناوە . . ئەویش بنیاتنانی سوپایەکی نیشتمانییە کە شایەنی راپەراندنی ئەرکە نیشتمانیو نەتەوەیەکانێتی ..

ئەوە بوو سوپای خۆشەویستمان .. پێش شۆڕش تووشی لاوازیو دواکەوتوویی بوو بوو . . شۆڕش هات . . بەبایەخدانێکی تایبەتی لەسەرکردایەتی حزبەوە بۆ بنیاتنانی بنیاتنانێکی نیشتمانیو نەتەوەیی بەهێز .. وە بە پڕچەك کردنی بە بەهێزترینو تازەترین چەك . . بۆ ئەوەی توانای سەربازیو تەکنیکی بلند بکەنەوە .. وە بۆ ئەوەی لە بلندترین رادەدا گیانی پەیوەندی نیشتمانیو پەیوەندی سەربازانەی رەسەنی .. هەلقولاوی مێژوو کەلەپوری مەزنمانیان تیادا بلاوبکەنەوە .

سوپاکەمان لە سایەی شۆڕشو سەرکردایەتی حزبدا بۆتە جێگای شانازی گەلو نەتەوەی عەرەبمان کە بەچاوی هیواوە تێی

دەنوارێت بۆ ئەوەی ئەرکە نەتەوەیەکانی راپەڕێنێت .. بەتایبەتی لەم دۆخە ناسکەدا کە بەرەوڕووی پیلانگێڕیٚ ئیستیعمارو زایونیو خیانەتکاری فەرمانڕەوایٚ میسر بۆتەوە ..

سوپاکەمان .. ئەی برایان .. بەتەواوی ئامادەیە کە ئەو ئەرکانە بەهەموو توانایەوە بەجیٚ بگەیەنێت .. و هیچ کۆسپێك رێگایٚ ئەوەی لیٚناگرێت .

ئەو جێگایەی لەسای شۆرشدا عیراق پیٚی گەیشتووە لە هەموو مەیدانێکدا .. وای لیٚکردووە کە بەراستی ئەو ئەرکە نەتەوایەتیانەی جیٚبەجیٚ بکات کە نەتەوەی عەرەبی چاوەڕوانی لیٚ دەکات . کاتی دۆخ لە ناوچەکەدا گەیشتە رادەیەك کە نەتەوە بخاتە بەر مەترسی ئەوەیٚ دووچاری نەکسەیەکی پڕ مەترسی بێت .. دوای ئەوەی فەرمانڕەوای میسر لە گەل دوژمندا بەرەو رێکەوتن چوو ... وە مەسەلەیٚ فەلەستینو مافی عەرەبی فرۆشت .. ئەوە بوو دۆخی عەرەب دووچاری رارای بوبو .. بەلکو پارچە پارچە بوون .. عیراق بەدەوری بەرپرسیاری نەتەوەیی خۆی هەستاو .. داوای پێکهێنانی نۆهەم کۆنگرەی بەرزیکرد لە تشرینی دووهەمی رابوردوودا .. کۆنگرەی بەرزی عەرەب بەپشتیوانی خواو هاوبەشی برایانی عەرەب توانی .. سنورێك بۆ ئەو حالەی هەرەس هێنانە دابنیٚ کە بەدوای رێکەوتنی کامب دیڤدی خیانەتکاریدا هاتە کایەوە .. وە بەشێکی چاك دۆخو پێویستی بەرەنگاربوونەوەی نەخشە خیانەت کارێکانی ئامادە بکات .. وە بە چەند هۆیەك بەربەستی بکات .. کە تاقیکردنەوە ئەوەیٚ سەلماندووە کە لە چەند روویەکەوە بەکارن .

● **لە رێگای یەکگرتندا .**

خوا پشتگیری کردین لەوەدا کە لەگەل برایانی سوریا بگەینە پەیوەندیەکی چاك .. کە بەپشتیوانی خوا بەرەو یەكبوون دەروات .. ئەو هیوا نەتەوەییە خۆشەویستەی کە هەموو عەرەبێکی شەریف چاوی تێبڕیوە .

توانیمان لە تشرینی یەکەمی رابوردوودا میساقی کاریٚ نەتەوەیی هاوبەش مۆر بکەین .. دوای چەند مانگی لە کاری ئیجابی بۆ چەسپاندنی پەیوەندی تایبەتی نێوان هەردوو ولاتمان .. توانیمان خۆمان بۆ رادەیەکی چاك بگوێزینەوە .. لە مانگی حوزەیرانی رابوردوودا رامانگەیاند .. بە پێك هێنانی سەرکردایەتیەکی سیاسی یەكگرتوو کە پەیوەندی نێوان هەردوو ولات بەهەنگاوێکی پێشکەوتووی دادەنرێت لە رێگای یەكبووندا ..

چاکەی ئەوە .. ئەی برایان .. کە شۆڕشی ١٧ی تەموز ئەم سیفاتانەی هەیەو لە سەرکەوتنیدا بەوە دەست هێنانی ئەم دەستکەوتە گەورانە .. بە دەرەجەی یەکەم دەگەرێتەوە ... بۆ ئەوەی هەلقولانێکی رەسەن لە دلی میللەتەوە هەلقولاوە .. لە خاکی نیشتمانەوە وە بەراستی تەعبیری لە خواستو ئازارو .. تموحەکانی کردووە .. وە ئەو پێشەنگە شۆرشگێڕیانەی ئەم شۆرشەیان وەدیهێنا .. حزبی مێژوویە .. حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی .

حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی .. حزبێکی ئاسایی نییە لەو حزبە سیاسیانەی ولاکەمان دیونی ئەو حزبی نەتەوەیٚ عەرەبە لە چەرخی ئێستایدا .. ئەو حزبی جەماوەریٚ عەرەبە .. کە بەراستی تەعبیر لە مێژووی نەتەوەیٚ عەرەبی دەکات .. وە لە کەسایەتی خولقێنەری .. وە ئامانجەکانی .. لەبەر ئەوە حزب توانی کە شۆرشی لە عیراقدا بەم شێوە کاملو قولە جیٚبەجیٚ بکاتو .. رەوتی تێکۆشانی میللی بەرەو سەرکەوتن بەرێت .

سەرەڕای ئەم سیفاتانەی حزب هەیەتی .. سیفاتی تریشی هەیە کە بەسیفاتێکی جەوهەری دادەینێن لە ژیانی نەتەوەی عەرەبیدا .. ئەویش ئەو سیفاتە رەوشتییە بەرزانەیە کە لە رەوشتی رەسەنی عەرەبو گیانی ئیسلامی مەزنەوەی وەرگرتووە .

سیفاتی رەوشتیٚی بەعسی .. یەکێکە لە عونسورە سەرەکیکانی هێزی .. وەك بزووتنەوەیەکی شۆرشگێڕی لایەنگیریو هەرەکەتی

# پێشخستن و گەشەکردنی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی لە ڕەوتی شۆڕشدا

عبدالرزاق بیمار

کەس ناتوانێ ئەو ڕاستییە بشارێتەوە کە ڕۆشنبیری ئەدەبی کوردی لەم ساڵانەی دواییدا بەتایبەتی پاش دەرچوونی بەیاننامەکەی ١١ی ئادار هەنگاوی زۆر گورج و گەورەی هەڵێناوە و بەرهەمی گەشەکەی چ لە لایەنی چەندیی و چ لە لایەنی چۆنییەوە چەندجارە و زۆر جارە زیادی کردووە . بۆ پشتیوانیی ئەم قسانە ژمارەی چاپەمەنیی و سەرژمێری لایەن و گشت پەلوپۆکانی ڕۆشنبیری و بزاوتی شارستانەتی چاکترین بەڵگەن و بە زمانێکی ڕەوان قسە دەکەن کە هیچ گومانی تێدا نامێنێ .. ژمارەی ڕۆژنامە ، گۆڤار ، کتێب و نامیلکە و ژمارەی لاپەڕەکانیان و دانەی لێ چاپکراویان و تەمەن درێژیی و سەروەرژییان نموونەیەکی بەردەستی ئەو پەرەسەندنە گەورەیەیە . خۆ ئەو دەزگا و دایەرە دەوڵەتییانەش کە لەم مەیدانەدا لە بزووتنەوە و چالاکیدابوون مایەی شادمانییە ، ئەوە بەڕێوەبەرێتیی خوێندنی کوردی ، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوە ، کۆڕی زانیاری ، جامیعەی سلێمانی و زانستگای ئاداب و دەزگاکانی ڕاگەیاندن .. ئەوە حزب و کۆمەڵە و یەکێتییە کوردیەکان ، ئەوە تاقم و تیپە هونەرییەکان ، هەر یەکێک لەمانە بەپێی دەست ڕۆیشتوویی و هەل و مەرجی تایبەتی خۆی لە چاپەمەنی،بزاوتی ڕۆشنبیری، کۆڕ و کۆبوونەوەی ئەدەبی و ڕۆشنبیری و ئاهەنگی هونەری دەست و دیاریی دیاری خۆی هەیە .

لە لایەن چۆنیەتیشەوە ، زوربەی لقەکانی ڕۆشنبیری گەشانەوەیان بەرکەوت ، لە ئەدەبدا ــ بە نموونە ــ چەشنەکانی وەکو چیرۆک و ڕەخنە و لێکۆڵینەوە ، لە زانستدا بەنموونە زمانەوانی و مێژوو ، لە هونەردا بە نموونە شانۆ نواندن و ئاهەنگ و گورانی، لە ڕۆژنامە نووسیدا هونەری دەرهێنان و نووسین و جۆرەها و چەندەها نموونەی‌تر کە هەربەکە گەواهی

پەل‌هاویشتنی جۆرو چەشنەکانی پەرەسەندنی رۆشنبیری کوردین لەم ماوەیەدا ، ئەمانەش زۆربەی زۆریان بە رێبازی پێشکەوتنخوازیو نەتەوەییدا رۆیشتوون ، خۆ ئەگەر هەموو لایەکەوە هەنگاوەکانی پێشکەوتن لە گورجو گولیدا وەکو یەك بوونایە لە داو نانەوەی ئەم لاو کوسپی ئەولا رزگاریان بووایە ، جلەوی کار هەلسووڕاندنو ئاراستەکردنیش هەتا سەر بەدەست پیاوی خۆیو لێهاتووەکان بووایەو رادەی سەرکەوتنەکە یەکبینەو سەرومر بووایەو .. بێگومان ئەنجامو بەرهەمەکانی رۆشنبیریمان ئەمرۆ چەندێکە ئەوسا نجگار زۆرتر زیادی دەکرد .

بێگومان ناتوانین لێرەدا تەنیا لکێك لە لکە زۆرەکانی ئەم پەرەسەندنە بگرینو بە تەواویو سەرلەبەر هەموو رووەکانی راپەرینو پێشکەوتنی بخەینەروو . با نموونە ئاورێك لە مەیدانەکانی پەرومردەو فێرکردندا بدەینەوە کە بەردی بناغەی رۆشنبیری گشتیو شارستانەتی نەتەوەن ، دەبینین لە سەرەتاوە تا ئەم دوایییە هەنگاوی گەورد گەورە نراوە . هەر شۆرشێك لەم مەیدانەدا هەلگیرسا کە مەشخەلی ئاگرە کەی زۆر کونو قوژبنی روناك کردەوە . ئەوەبوو لیژنە رێكخران لەپارێزگاکانی ژووروودا بە گوێرەی زمانی زوربەی دانیشتووان قوتابخانەیان بۆ بەکوردی خوێندن جیاکردەوە،بڕیاردر هەموو خوێندن لە سەرەتاییەوە تا دوا پلەی قۆناغی ئامادەیی بە کوردی بێتو زمانی کوردی لە هەموو سانەوییەکانی عیراقدا بخوێندرێت ، بۆ یەکەم جار لە مێژوودا مێژووی کورد خرایە ناو بەرنامەو کتێبەکانی بابەتی کۆمەلایەتی لە قوتابخانەکانی سەرتاپای عیراقدا ، هەروەها بۆ یەکەمین جار ئەدەبو رێزمانی کوردی بوون بەدەرسی تایبەتیو لە قۆناغی ناوەندیو ئامادەیی قوتابخانە کوردییەکاندا خوێندران ، ژمارەیەکی زۆر قوتابخانە لە زوربەی دێهاتو شارەکاندا کرایەوەو بە کەلوپەلی پویستو خانووی تازەوە .

بۆ ئەمەش بەڕێوەبەرێتیی خوێندنی کوردی بووژمێترایەوەو بۆ یەکەم جار ( پەیڕەو ) ێکی بۆ هاتە داڕشتن کە وەکو دەزگایەکی گەورە ئەرکو فەرمانەکانو بەشودایەرەکانی دیاریکراوئەویش کەوتە کار بۆ سەرپەرشتی کردنی خوێندن لە کوردستانو کەوتە وەرگێڕانو دانانی کتێبی قوتابخانەیی ، هەر لەم ماوەیەشدا گۆڤارێکی تایبەتیو زنجیرەیەك نامیلکەی فێرکردنی مندالانی دەرکردو لە رێگەی لیژنەی پشتگیریی چاپکردنەوە یارمەتی لە چاپدانی کۆمەلە کتێبێکی باشیدا جاران کە وادەرپەڕی کە لە خانەی ملیۆنیش تێپەڕیکرد . نزیکەی ۱۰۰ کتێبی کوردی چ بە دانانو چ بە کردنە کوردی کەوتنە قوتابخانەکان . مایەی خۆشبەختییە بۆ یەکەم جار زمانی کوردی توانی بال بەسەر کیمیاو فیزیاو ئەندازەو جەبرو زانستەکانی سروشتو ئابووریدا بکێشێتو لە بەرامبەر گەورەترین تاقیکردنەوەی شارستانەتیدا خۆی بگرێتو زیندوویيو کارامەیی خۆی لەم مەیدانەدا ساغبکاتەوەو دەریبخاتو توواناى گەشەکردنو رەگ داکوتانی زۆرەو لەمەشدا هیچی لە زمانانی تر کەمتر نییە .

جا ئەوەی باسم لەچاو فێرکردنو پەروەردەوە نموونەیەکە لە نموونە زۆرەکانی ئەو پەردسەندنو پێشکەوتنەی رۆشنبیریی کوردی لە ژێر سێبەری شۆرشی تەمووزدا بەخۆیەوە دیتووە ، هەر لایەنێك لە لایەنەکانی تریش کە لە پێشەوە ناوم هێنان بێگومان بەرهەمی پێشکەوتنو گەشەکردنی لە مەیدانی شارەزەییو دەسەلاتی بۆ رەخساوی خۆیدا ئەوەندە زۆرە کە هەرگیز شایانی بەراووردکردن نییە لەگەل رابردوودا .

# بەفێربوونی رۆڵەکانی ، نەتەوەگەشەدەکات وپێشدەکەوێت

# لاوك

# برۆیێ شەرقی

## بەشی یەکەم

**● خلیل جندی ●**

— ١ —

**دانەری زۆربەی ئاوازو لاوکو حەیرانی کرمانجی ژوورو ، خاوەنی دەنگی زولالو ئاوازی بەجۆش ، پالەوانی پێکهێنانی ووشە ، چراو مۆمی دیوەخانی ئبراهیم پاشایی میللی ، سترانبێژی بەناوبانگی کورد « برۆیێ شەرقی » یە .**

« برۆ » کوڕی « کەچەل » بووە . واتە ناوی باوکی — کەچەل — بووە.و ناوبانگی بە « برۆیێ‌شەرقی » دەرکردووە ، « شەرقی » ناوی عەشیرەتێکی ئێزدیە . دەنگو ئاوازی « برۆ » ئەوەندە خۆش‌بووە هەتا بووە بە سترانبێژی ئیبراهیم پاشایی میللی . دەڵێن زۆربەی زۆری ئەم لاوکانەی کە ئێستا لە ناوچەی کرمانجی ژووروودا هەن لەدانانو ئاوازی ئەون ،

سترانبێژی بەناوبانگی هاوچەرخ « پیر گرۆیێ‌شنکاری » کە ئێستا تەمەنی دەورو بەری (٦٥) ساڵەو چاوی بە « برۆ » کەوتووە ، هەندێ لاوکی لێ فێربووبوو ، وامان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێ :

— کاتێك چاوم بە «برۆ» کەوت لە تەمەنی پیری‌دابوو . بەڵام هەتا بڵێی ررۆڤێکی قۆزو لاو بوو . برۆیێ شەرقی لە کاتی پیرەمێری‌یەکەیدا لەگەڵێ خۆرتو لاوان جوانتربوو ... خاوەنی دەمو چاوێکی پاکو پاقژ ، لووتێکی بەرانیو چاوو برۆیێکی گەشو ڕەش . پیاوێکی خوێن گەرمو شرین‌بوو ....

برۆیێ شەرقی لە گوندی ( سولاف ) کە لە رۆژهەڵاتی شنکارە ژنی هێناوەو پاشان چۆتە گوندی ( جلالێ ) لە رۆژئاوای شنکارو شەش حەوت ساڵان لەوێدا ماوەو دوایی مردنی ئبراهیم پاشا رۆیشتۆتە وولاتی ( خالتیا ) واتە چۆوە ناو ئێزدیەکانی تورکیاو لەوێ مردوە تەرمەکەی لەسەر گردی « چەتەلێ » نێژراوەو کوڕێك بە ناوی — عەبدۆ — لەپاش بەجێ ماوەو ، ئێستا لە گوندی ( رەمبوسی ) لە شنکار نیشتەجێ‌یە :

بە پێی قسەی — پیر گرۆ — ئەم چاو پێ‌کەوتنە پێش (٤٠) ساڵبوو پاشی ئەم مێژووە «برۆ» نەماوە . واتە کۆچی دوایی کردووە ، کەوابوو دەتوانین بڵێین « برۆ » لە ساڵانی سیداو لە دەورو بەری ١٩٣٤ — ١٩٣٥دا مردووە . هەروەها دەڵێت کە بینیم تەمەنی دەورو بەری (٧٠) ساڵبوو . بەسەر ئەم گۆتنە دەتوانین بڵێین کە — برۆیێ شەرقین — لە ئاخرو ئۆخری چەرخی نۆزدەهەم لە دایك‌بووە . بەم جێگای لە دایك بوونی دیار .

هەر چۆنێ‌بێ ، ئەمە کورتە باسێك‌بوو لە ژیانو بەسەرهاتی « برۆ » . بەڵام ئەوەی گرنگو فەرترە ، پشکنینو هەڵدا ئەوەی لاپەڕێکی شاراوەی ژیانو بەسەرهاتی — ئبراهیم پاشای میللی — یە ، لە سەر زمانی نێزیکترین پیاوەکانی کە — برۆیێ شەرقی — بووە . — برۆیێ شەرقی — بە زمانی خۆی هەندێ رووداوەکانی ئبراهیم پاشا بۆ پیر گرۆ — گێڕاوەتەوەو وتبووی :

— رۆژێك ئبراهیم پاشا شەش حوشتری بار رونو سەدو پەنجا سوار لەگەڵ خۆیدا لە شامەوە بەرەو تورکیا بردووە بۆ سەردانی سولتان عبد الحمید « برۆ » دەزانی کە ئبراهیم پاشا حەز لە کچێك دەکات

بە ناوی [ پەرۆ ] کە لە هەمان عەشیرەتی میللی بوو . بەڵام ئەم عەشیرەتە دوو تیرەن ، میللی عەدوانیو میللی کبیر. ئیبراهیم پاشا لە تیرەی میللی عەدوانیبوو . ( پەرۆ ) ش لە میللی کبیربوو . ووتی « برۆ » هەستا بە ڕێگادا سترانێك بە سەر ئیبراهیمو پەرۆدا ئەهۆنێتەوە ، بە ناوی « پەروا دلا » :

**« ئەمان ئەمان ئەمان بەگێ منۆ ،**
**بەلێ بلا لمنو بەژنا زراف ، دیمێ گولی هلئەماتبا**
**سنتێرا قمرە بەرِ مانگێ سبێ ، ستێرا زمرە ،**
**دەخودێ زانە پێرو هلاتن ، مێزینا(١) خۆدا هەمبەرە(٢)**
**سنگو بەرێ خەلکێ دەلال نەبوونە تەختێ عبدالحمید**
**دمولەێ عالیا مجلسێ ئەفسەرە .**
**بەگێ منۆ ئەز بدمردم ....... »**

پاش تەواوکردنی ئەم سترانە ، سترانێکی ترم بەسەر « عەدولێو د.روێشێ عەبدی »داگوت ، بێئەوەی ناویان بێنم . سترانەکەشم بە ناوی « لێلێ بەرخێ » بەوە هۆنیەرە . هەروەها سترانێکی دی بە ناوی « دەلالێ قرشیا » هاوێتمە سەر ـ عەدولێو دەروێشێ عەبدی ـ :

**« لێ لێ لێ لێ بەرخی لی سەبرا من لێ ،**
**لێ لێ بەرخێ ئەزێ بێژم قرشیاکە منە قرشیانێ ،**
**لێ بەتوری بەتارا گرتە قرشیاکە منە قرشیانێ ،**
**منێ خەلکێ دەلالی جۆگانی دیتبوو ل گالەموشایێ**
**ویران**
**لبەر بننێ گەوریکێ(٣) دباری ڤی هەموشانێ ،**
**ئەزێ تەرکا خەلکێ دەلال ، بەژنا زراڤ ، دیمێ گولی**
**نادەم هەتا زارۆ لگەرا لنیڤا مالا نەبێژن لۆ لۆ یابۆ**
**لێ لێ خەینێ یادێ لۆ لۆ ..... »**

کە گەیشتینە کەناری بازێری شامەوە هەستام ـ واتە برۆ ـ عەدوانێم گوت :

**« بەژنا عەدوانێ منە زراڤە ، دار ژ دارێ گێرانێ ،**
**دەوێ شین دکە ل شاما شرین مەحەلێ صالحیا ئەز**
**کەمگازێ ،**
**خودێ ئاڤا نەکە مالا چەلەبێو بێ بەختێ گوندێ مە**
**سەرێ سەبەیا خێرێ نەبینن لۆ لۆ لۆ مەلولۆ .**
**دەچاوا ئەڤە سێ رۆژە بەرێ عەدوانێ من دانە**
**کنارێ قوبلەتێ ئەرێ دەستێ عەدوانێ من ڤوتکرو**
**هەرسێ دمقێد سۆری سەماوی ، بۆخازێ ،**
**مەلۆلوۆ لۆ مەلولۆ لۆ .**
**دەرێکا شاما شرین مەحەلا صالحی ڤوناغ دوورۆ .. »**

رکێفی هەسپەکەم بە رکێفی هەسپەکەی ئیبراهیم پاشاوە بوو . ئەم سێ سترانەم بەسەر دڵو ئەینەتی خۆم هۆینەنەوە ئیبراهیم پاشا بە سەر مندا گەڕایەوەو ووتی :

ـ برۆ ماڵت کاولبێت ، ئەم سترانانە لە گیرفانت هێنانەدەر ، لە کوێتبوون ... بۆ پێشان لە ماڵەوە نەتدەگوتن !! ئیبراهیم پاشا پێیزانی کە لە سەر ناوی « پەرۆ » هەڵیدایەوەو « عەدوانێ » بەسەر ناوەکەی بەڵام نەیزانی « دەلالی قرشیا » بەسەر کێیە .

پاشان کە گەیشتینە بازێری شام پچووکو گەورەی ئەم شارە دەرکەوتنە سەیرکردنمان . ئێمەش بە گۆرانی ووتنو ستران و شەیلغان لە شامەوە تێپەڕبووین .

بۆ ماوەیەك ئەم لقو شاخە بەجێ دێلینو دەچینە سەر شاخێکی تری بابەتەکەمان ، کە پەیوەندی بە « برۆ » وە هەیە . ئەویش شەڕی ووشەو هۆنینەوەی بەندو ستران نێوان «برۆیێ شەرقی»و«بەساخەلیل»و « خدری حەبلو » . ئەمەش ڕووێکی قەشەنگی ئەدەبی کوردییە :

وابزانم کەم کەس هەیە ناوی « بەسا خەلیل » لە دیوەخانانو ئەدەبی فۆلکلۆری نەبیستێت ، بە تایبەتی بە هۆی سترانەکەی کە بەسەر « براهیمکێ تەمۆ » هەڵیداوە ـ « براهیمی تەمۆ » پیاوێکی دەوڵەمەندبوە دوو ژنی هەبووە بابی ( بەسێ ) دەیویست بە زۆری بەسێی بداتێ . « بەسێ »ش هەستا سترانە بەناو بانگەکەی « براهیمکێ تەمۆ » دانا تێدا ئێشو ئازاری دڵەکەی دەردەخاتو سەرزەنشتی ئەو خوورەوشتە ناڵەبارانە دەکات کە کچ بەزۆرە ملێو بێرەزای خۆی مێرد دەکاتو دەفرۆشرێت ..

هەرچۆنێ بێت ڕۆژێك ( ئیبراهیم پاشاو برۆو خدری حەبلۆ ) ڕۆیشتونەتە گوندی ( نورەدینێ ) کە گوندی بابی بەسێ بووە . برۆیێ وتویە : ئێمە ناوی «بەسێ»و سترانەکەیمان بیستووە،تێدا شانازی بە خۆیکردووە، تڤنم وایەو چاوم وایەو قەدو باڵام وایە ، ..... و هاوێتبووە براهیمکێ تەمۆو شکێناندبوو . ووتی ، منو خدرێ حەبلۆ بڕیارماندا بڕۆینو بەسێ ببینین پرسیارمانکرد بەسێ لە کوێیە ؟ ... ووتیان چووەتە ناو باخچەی دەمی گەلی . ڕویشتینە ئەو دیوە بینیمان سێ کچ تەشی دەڕێسنو وەك یەك جوانن . نەمانزانی بەسێ کامیانە . پرسیمان بەسێ کێیە !

# فێرکردنی ئافرەت پێشکەوتنی نەتەوەکەمانە

... یەکیان ووتی ها ئێوە چیتان لە بەسێ دەوێت !
... من بەسیمە . پشتی سلاوو خترو خۆشــی لێ‌کردن ووتمان ! ئێمە دەزانین کە براهیمێ تەمــۆ خاوەنی ئاشێ ئاوەو خاوەنی ردزو پەزو گاوو گامێشـە، بۆ واتلێ کردوەو لە سترانەکەتـدا ناوی بە خرابی دەبەی‌و دەیشکێنی .

بەسێ ووتی :

ـ لاوی قەنج ئێوە من‌و جوانیەکەم دەبینن . خـۆی خاوەنی دوو ژنان‌بوو . دلم نەدەخواست شوی‌پێ‌بکەم. ئینجا هەستام سترانێکم هاوێتە سـەر . پێمـان ووت‌دورکی ( بەند ) هــەرە بـــەرێ چیت ووت .

بەسێ ووتی :

« لێ لێ دایێ ، لێ لی دایی ،
من کحێلا (٤) سەرێ تەولایێ
من غەزالا سەرێ گێلایێ ،
من تڤەنگا بەر گرێ بەندایێ ،
نەو بەسێ باند کە دبێژێ ،
لۆ لۆ براهیمۆ ( سکیا ) من ل چاڤا کەتو وێ رۆناکێ ،
بەلێ خودێ دزانبە ئەز کەچکا خەلکێ ماشاللا خودێ ناکەم ،
گاڤا چاڤێ من ئێکی وەکی تەهار ئاغا ژمالا محمــد بەگێ
جزیرێ بۆتی طەنگا جانێ منرا ،
ئەزێ لبەرا بەهشم خۆ لڤاکەم ،
بەلێ قرارا خودێ ئەزێ خۆ ب سێ تەلاڤا ژ براهیمکێ تەمۆ خۆ تەلاف دەم ..... »

هەتا بووە عەسرەکە درەنگ بەسێ هەر هاوێتە سەر براهیمکێ تەمۆو سترانەکەی گوت . بەسێ نەدەزانی کە ئێمە ئێزدینە چونکـــە چەفتی‌و عـــەگالمـــان بەسـەرەوەبوو ، نەددزانی ئێمە چی‌کەسین ، شاعیرین ، رێبوارین . برۆ ووتی : ناکاودا دورکەکمان ( بەند ) هاوێتە سـەر بەسێ :

« تە چاف رەشێ تەچاف خومری ،
نەڤە سەرێ سێ رۆژا ژ حسابێ مێرێ خراب تـو دهۆنژی تو دکەی بمری ،
تو رابە دەستێ خۆ دنێڤینا دەستێ من کە ، تـــە بـرەڤینمە سەر سینورێ وی گاوری .... »

هەلبەت سـەلیقەو ئاوازی بەندەکەمان لەسەر هــی بەسێ نەبوون ، کە بەسەر براهیمکێ تەمۆ گوتبوون.. پاشان بەسێ لێمان گەڕایەوەو ووتی :

« قوربان عەمر چار ماێد نێف کێلیدا ،
لاوکێ من خەنجەر گرێدا بـسەر سایێ (٥) سپیدا ،
تو خەما مەخۆ ، من جۆتێ مەمکا ژتەرا تێزی کرنە بن گرلیو تێڤیدا . »

خدری حەبلۆ هاوێتە سـەر ، کە هێشتا لە بـــرۆ شاعیرتر بوو :

« لێ لێ بەسێ دیاری من‌و گوندێ نورەدینێ ،
رەشبێشەکە بلرانێ گرتە قۆنتارا چیایێ قەرتەلینێ ،
چاوا کێ دبێ ، کێ بینابێ کوندەکی ژکێرا بازدە لسەر هێلانا گۆگە چینێ . » (٦)

بەسێ ووتی :

« بەژنا منە زراڤە کولیلکا نێڤا پێدەرە ،
کراسەکی لبەر بەژنا بەسێ‌یە مەگرومێ گەورە ،
سەرێ مەمکا تێرا دایە دەرە ،
هەچی خۆرتێ نوهاتی بێ ، لبەر بەژنا کەوا گۆزەل کە رازێ ، دلێ خۆدا ناهێلێ تو کولا تو کەسەرە . »

برۆێ بانگ کردو :

« لێ لێ بەسێ سنێرەکە هلاتی ژکنارێ ئاشیکە ،
بلا شەوقێ نەدابە کێسم غەزالا گەردەن چێنە ،
بلا من راموسانا کەوا گۆزەل بسەرێ چاڤێ خـــۆ بدێنە . »

بەسێ بانگی کرد :

« قوربان من لاوکی خۆ نەدیە ئەڤرۆ دورۆ ، (٧)
قوربان تو وەرە دێری ڤەکە وەرە هندرۆ ، (٨)

**خۆزگە بـهنگی بێ سبەهێ ئەزو تە ڕابن ، تو**
**بێژی کەچێ ئەزم بێژم کودۆ . »**
خدری لێ گێڕایەوە :
**« کەچێ دینێ تو رابە دیری (٩) ڤەکە ،**
**تو ڤانۆسێ پاڤێژە وان تیرەکە ،**
**سینگێو بەرێ کەوا گۆمزل ژ منرا نەبونە کەندالـێ**
**حەنەکە . » (١٠)**

بەسێ ووتی :
**« لاوکۆ قوربان تو بخێر هاتی ،**
**ئەڤە سەرێ سێ رۆژی تەمامن ڤاسدێ نێڤ منو**
**بەینا بەژنا زراڤدا بوونە ڤاسی ،**
**سۆزو قرباریبد منو خەلکێ دەلال ، بەژنا زراڤ خلاس**
**بوون ئەڤرۆ کالە مێرەکی هەفتی سالی ، شـــڤانەکی**
**قەولێ وی نوو هلاتی . »**
هەتا ئێوارە هەر سێکیان کەوتنە زۆرانبازی ووشـــەو
شەڕی ئاواز تا لە دوایدا برۆیێ ووتی
**« هەیڤا مە هلاتی چاردە شەڤی ،**
**بلا شەوقێ نەدایە مەحەلا مـــەشکێنا دارو دەڤی ،**
**ئەمێ چەپلێ بەژنا زراڤ بگرین چنە شەرعا بەنی**
**سەڤی ،**
**بنێ بەژنا زراڤ ، دیمێ گولی ژکێرا دکەڤی . »**
بەسێ یەکسەر ووتی :
**« بە قورعان ژتەڕا دکەڤی » .**

دەســـکـەوتـــی

تاکە کەسێك لە بەرهەمی

ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا سالی ۱۹۶۷ تا

سالی ۱۹۷۷ لە دیناریکەوە بووە بە

۱.۲ دینارتا سالی ۱۹۷۹ گەیشتە

۱۷۹ دیـــنـــار

کەبووە ئێوارەو گەڕانەوە ماڵ بەسێ نـــەیویســـتو ئەهێلا « برۆو خدر » بچنەوە لای ئبراهیم پاشا ، ووتی : ئێوە مێوانمانن . هەردوو کچەکانی تریش کە ناویان « حێێو نورێ » بوون لەگەلیان بوون ، هەر پێنج کەوتنە پالیەکو بەرەو گوندەوە کەوتنە ڕێ . برۆ ووتی : گەلێکمان هەولدا خۆمان لە دەســـتی (بەسێ) رزگاربکەین ئەمان توانیو بینیمان دلی خراپە. ووتمان : بەسێ ئێمە شاعیری ئبراهیم‌پاشا . ئاخری چارەی پێ‌نەبوو . ووتمان : ــ ئێمە ئێزدینە ! ووتی : چاوتان کوێربێت . دەلێن ئێزدینە ، باوەڕ نەدەکرد . ئاخر بە هەر جۆرێك بێت خۆیان لە دەستی‌رزگارکرد. لێرەدا کۆتایی بە ووتاری ئەمجارەمان دێنین ، تـــا زنجیرەیێکی‌ترو باسێکی نوێی برۆیـــێ شـەرفـــیو ئبراهیم پاشایێ میللی .

**( پەراوێز ) : ــ**

(١) پێرو تەرازو : ناوی هەندێ ئەستێرەن لــــە ئاسمانەوە شێوەیان بە تەرازو دەچێت .
(٢) همبەر : بەرامبەر .
(٣) بتنێ گەوریکی : ناوی جۆرە (نبات)ێکە .
(٤) کحێل : بۆ ماین دەووترێت .
(٥) سایی : ناوی جۆرە کراسێکە .
(٦) گۆگەچین : کۆتر .
(٧) دوورۆ : دوورۆژان .
(٨) هنرۆ : خانوو ژوور .
(٩) دێری : دەرگا . قاپی
(١٠) حەنەك ، یاری : وازی .

# روونکردنەوەیەکی دیکە

• مسعود محمد •

له لاپەرە (١٧٥)ی کتێبە پڕ ســــوودە تــــازە بابەتەکەی دکتۆر کەمال مـــــەزهەر کـــــە تۆژینەوەو پشکنینەوەی تێداکــردوە • لەبـــــارەی ڕۆژنامـــــەی ( تێگەیشتنی راستی ) یەوە ، دوو بەیتی مـــــستەفا بەگی کوردی نەختێك بە ئالوزی لە لایەن نووسەری کۆنە ڕۆژنامەکەوە،کاتی خۆی ، واتایان لێ دراوەتەوە. دواتریش کە بەیتەکان لە ( دیوانی کوردی ) دا چاپ کراون بە هۆی گۆڕینی یەك وشەیان هەر بە جارێ چ پێوەندییەکیان بەو واتاو مەبەستەوە نەماوە کە دڵو دەروونی مستەفا بەگیان جۆشاندوە .

بە پێی کتێبەکەی دکتۆر کەمال ئەو دوو بەیتە لە ڕۆژنامەی ( تێگەیشتنی راستی ) دا بـــــەم شێوەیە نووسراون :

**خەبەریکم بەدەنێ ئەهلی خەبەر حەشرە مەگەر**
**رۆژی ئەمرۆ کە لە مەغریب سەری هێناوەتە دەر**
**نوری مەهدی لە تەرەف مەککەوە زاهیر بوەیا**
**غەلەبەی رۆمەلە بۆ کوشتنی ( من کان کفر )**

نووسەری ( تێگەیشتنی راستی ) بۆ ئەوە چوە کە ئەم دوو بەیتە پەنجە رادەکێشن بۆ ئەو ڕۆژەی کە تورکەکان سلێمانییان داگیر کردوەو سەربەخۆیـــی حاکمایەتی بابانیان لەبنهێناوە .

بۆ ئەوەی واتای بەیتەکـــان لــــە تاریکیــــــدا نەهێلینەوە پێویستە سەر لەبەری قەسیدەکە بخەینە بەرچاو تا ببینین تێکرایان بــــەرەو چ وینەیەکمانەوە دەکەنەوە .

لە بەیازێکی شکڵ کەشکۆلی کە وەختی خۆی لە لایەن خوالێخۆش بووی ( نیهانی ـ شێخ موحیی ددینی شێخ کەریمی بەرزنجی کۆیێ ) نووسراوەتەوە دەقی برە شیعرەکە ئەمەیە :

**خەبەریکم بدەنێ ئەهلی خەبەر حەشرە مەگەر**
**رۆژ کەوا ئەمرۆ لە مەغریب سەری هێناوەتەدەر**
**نوریمەهدی لە تەرەف مەککەوە زاهیر بوە یا**
**غەلەبەی رۆمە لە بۆ کوشتنی من کان کفــر**
**ئەشکی خوێنینە بە چاوما بە گرێ وەستاوە**
**یاغوباری ئەلەمە باعیسی عومیانـــی بەســـر**
**خەوە یا وەسوەسەیە یانــــە بەرەنێولمـــــەینە**
**ئەم عەلامانە کەوا دێتە ئەبـــــەر مەددی نەزەر**
**رۆحی شیرینە کە دەردێ لەتەنی مەهجـــوورم**
**یا مەهی من نییەلی ریحلەتە بۆ عەزمی سەفەر**
**بۆ سەفەر کردەیی من لایقە گەر بەدری فەلەك**

**بێتە سەر دەستی‌یو(١) بۆ رەددی عەدوو بێ بە سوپەر**

**باوجود تا کە رەقیب یاوەری ئەم دلبەرە بێ**
**هیچ تەفاوت نیە بۆ من لە سەفەر یا لە حەزەر**
**دائیما دەست بە دوعا بەندەو شایەد زوو زوو**
**شای سەفەر کردەیی من بێتەوە بێ عەجزو زەرەر**
**سۆزشی کوردیبە یا جۆششی ئەییامی فیراق**
**ئاتەشی عیشقە مەگەر یا شەرەری ناری سەقەر**

وابزانم بەیتەکان دەمەتەقە هەڵناگرن لەوەدا کە لە موناسەبەی سەفەرکردن‌و دوورکەوتنەوەی خۆشەویستێکی ( کوردی ) بەو پەڕی کزەو سۆزو پەرۆشەوە لە ناخی دڵو دەررونێکی هەڵقرچاوەوە سەریان کردووە تا دەبینین لە کۆتایی شیعرەکاندا کزەو سۆز سەر بە ( ناری سەقەر ) دەگەیەنن ، لەوەش پتر داوا لە شیعرن نا کرێ کە دەستە چیلەی ئازاری دووری‌و جۆشی عیشق ئاگر بەر بداتە گیان‌و وجودی شاعیر وەك کە لێرەدا ( سۆزی کوردی‌و جۆشی فیراق‌و ئاتەشی عیشق‌و شەرەری سەقەر ) خەریکن پارچە شیعرەکە بە خاوەنیەوە بسووتێنن . وا پێ دەچێ نووسەرەکەی ئەو کۆنە رۆژنامەیە ( غەلەبەی رۆم ) ی بەهەل زانیوە بۆ ئەوەی دوو نیشان بە یەك تیر بپێکێت ، یەکێکیان دزیۆ کردنی ناوی تورکەکانە کە مەبەستێکی هەرەبنجی رۆژنامەکە بووە لەو سەردەمەدا ، ئەوی دیکەشیان بزاوتنی دەماری کوردایەتییە لە دەروونی خوێنەرانی ئەوسای کورددا. وەك دکتۆر کەمال بۆی چووە دەبێ خاوەنی نووسینەکە شوکری فەزلی بووبێت کە سوار چاکێکی ئەوسای جووتە مەیدانی کوردایەتی‌و ئەدەب بووەو لەگەڵ مێجەرسۆندا سەرپەرشتی دەرچوونی رۆژنامەکەی کردووە .

ئەوەی بەلای منەوە جێی سەرسوڕمانە شتێکە سەر بەواتای ( غەلەبەی رۆم ) ە کە شوکری فەزلی خۆی لێ دزیوەتەوە وەیا بەجارێ هەر بۆی نەچوە ، واش پێ دەچێ بۆ نەچوونە کە راست بێ نەك خۆلێ‌دزینەوە چونکە ئەگەر شەبەنگی ئەو واتایە بە میشکیدا تێپەڕیبایە نەدەشیا پشت گوێی بخات چونکە ئەوسا دەیزانی خوێنەری ئەوتۆ زۆرن واتای راستیبەی ( غەلەبەی رۆم ) بزانن‌و خۆلێ بێ‌دەنگ کردنی بە ناتەواوی لەسەر حیساب بکەن .

بێگومان ئەم ( غەلەبەی رۆم ) ە هێنانی تێشکێکی قورنانە بۆ ناو هەڵبەست کە جارێکیان لە سەرەتاکانی پەیدابوونی ئیسلامەتیدا رۆمەکان لە ئاست فارسەکاندا شکست دەهێنن ئیتر کافرەکانی قوردیش ئەم شکستەی ( ئەهلی کیتاب ) بەرانبەر مەجووسییان‌یان کرد بە تانەو لە موسڵمانەکانیان گرت کە گۆیا بە پێی چاوەڕوانی کردن لە قورئان‌و باوەڕی ئیسلام نەدەبوو رۆمی خواپەرست بە دەست فارسی ئاگر پەرستەوە شکست خوردەبن ، قورئانیش لە سووردی ( الروم ) بەم شێوەیە وەرامی کافرەکانی دایەوە : « بسم الله الرحمن الرحيم . الم . غلبت الروم. فى ادنى الارض وهم من بعد غلبهم سيغلبون. » وموژدەی سەرکەوتنێکی نزیکی رۆمەکانی بە خەلق راگەیاند زۆریشی پێ نەچوو سەرکەوتن ..

مستەفا بەگی کوردی لە ( غەلەبەی رۆم ) مەبەستی سەرکەوتنەکەیە نەك ژێرکەوتنەکەی (غلبت) چونکە دیارە لە بەیتەکەدا ( سيغلبون ) لەگەڵ ( کوشتنی من کان کفر ) دەگونجێت ، هەر ئەمەیشە هاوجینسی دەرکەوتنی نوری مەهدیيە لە مەککە .

لێرەدا ردنگە گرفتێك بێتە بەر زیهنی خوێنەرەوەو بلێت کە مەبەستی ( کوردی ) لەو بەیتانەدا سەفەرکردنی خۆشەویستەکەی بێت چۆن دەگونجێ باسی زاهیر بوونی نوری مەهدی‌و غەلەبەی رۆم بکات کە پێچەوانەی ، دوورکەوتنەوەن : دەبوو رۆژ ئاوابوون‌و نور بزربوون بکات بە ماکی تەشبیهی ئەو دوور کەوتنەوەیە . ئەم گرفتە لە دوو رووی زۆر روونەوە وەلام دەدرێتەوە :

رووی یەکەم ئەوەیە کە هەمو برە شیعرەکە خەریکی دادو برویە لە دەست سەفەرکردنی خۆشە ویستی شاعیر ، تەنانەت قەسیدەکە دەشێ بکرێ بە نموونەی قەسیدەی خاودن ( وحده ) ، جا ئەگەر ئێمە بێین لەبەر خاتری بۆرە تەگەرەیەك دوو بەیتی سەرەتای قەسیدەکە لە لەشی قەسیدەکە ببڕین وەك ئەوەیە کە سەری گیان لەبەرێك ببڕیر پەکی ژیانی بخەین .

رووی دوەم هێزێکی تەواویش دەداتەوە بە رووی یەکەم بەوەدا کە سەرلەبەری ئەو وێنە پڕ هەڵپەو کڵپانەی کە لە قەسیدەکەدا نەخشەی باری نەفسی‌و عاتیفی شاعیر دەکێشن هەمویان ، تاك تاكو بە یەکەوە ، حالەتێکی جەزبە گرتووانەو خۆون‌کردوانە دەدەنەوە کەوا کەمتر بەوە رادەگات کێشانەو پێوانەی

وردی مەنتیف کاری لەگەڵ خۆیدا بکات . ئەم جەزبەو خۆ ونکردنە پتر نوری مەهدی وغەلەبەی رۆم و ئەشکی خوێنین و غوباری ئەلەمو خەوو وەسوە سەو . . هتد کۆ دەکاتەوە لەوەی کە کارەساتی زۆر ناسازی داگیرکرانی سلێمانی کە لە ( غەلەبەی رۆم ) ەوە دیاری دەدا لەگەڵ هەڵاتنی نوری مەهدی لە مەککە یەکدی بگرنەوە چونکە نوری مەهدی ناشێ ئەو نارەوایە بێ کە سفتوسۆی داگیرکرانی وڵاتی پێ بناسرێتەوە . هەرچەند شوکری فەزلی ویستویەتی بۆرە تەئویلێك بۆ ئەم لایەنە بهێنێتەوە ( کتێبەکەی دکتۆر کەمال . بخوتنەوە ) بەڵام هیچ تەئویلو گونجاندنێك بایی ئەوە ناکات کە بەبێ بەڵگە دوو بەیتی سەرەتای قەسیدەکە لێی دابڕێتو بۆ لایەنێکی نادیارو تێنەخوێندرایەوە ببرێتەوە .

دوور نابیم سەفەری خۆشە و یستەکەی(کوردی) بەرەو ڕۆژاوا بووبێتو لەوەوە عەلامەتێکی قیامەتی . هەڵاتنی رۆژە لە ڕۆژاواوە ، وەپاڵ عەلامەتێکی دیکەی قیامەت ، کە دەرکەوتنی مەهدییە ، دابێتو رەوای پرسیارکردنی لەبارەی حەشرەوە دیبێت . لە دوو بەیتەکەی سەرەتای هەڵبەست ، کوردی ، زێدە شارەزایی خۆی بە هەواڵی دینو ئایین و بڕوا بەدەستەوە داوە هەرچەند پێشیەوە دیار نییە کە دەرحستنی ئەو شارەزایییەی مەبەست بووبێت چونکە رەوانی هەڵبەستەکەو مشت بوونی لە سۆزو کەفو کوڵی عاتیقە چ هەناسە سواری خۆ هەڵدانەوەی تێدا د.رناکەوێت.زێدە شارەزاییەکەی لە هەردوو بەیتدا بە تێکڕایی‌و لە ( ئەهلی خەبەر ) بەتایبەتی دیار دەداتەوە ، لەو رووەوە کە ئەوانەی سەرکاریان لەگەڵ خەبەراتی حەشر و قیامەت هەیە پێیان دەڵێن ( ئەهلی خەبەر ) .

لە نیوە دێڕی بەیتی یەکەمدا ( کوردی ) دارشتنێکی فیعلی ( دان ) ی بەکار هێناوە کە ئێستاکە لە سلێمانی خەریکە بە تەواوی ون دەبێت : گوتوەتی ( خەبەرێکم بدەنێ ) و ئەم ( ێ ) ی بە فیعلەکەوە نووساندووە کە من لە نووسینی خۆمدا پێی دەڵێم (ێ)ی رێژەی ئینتیقالی‌و لەگەڵ کۆمەڵە فعلێکی کوردیدا دێن وەك ( دامێ ، کردمێ ، بوومێ ، گەپیشتمێ ، چوومێ ، نۆڕیمێ . . هتد ) . نالیش ئەم رێژەیەی بەکارهێناوە وەك کە دەڵێ .

**وای فەرمو کە ماچت نەدەمی ڕوو ڕەشی‌تور بم**
**ئەمساله بەجێ دێ ئەسەری وەعدەیی پاری**
**نابێ (تۆ) بنووسرێت چونکە رەونەقی شیعرەکەو**

نابێ (تۆ) بنووسرێك چونکە رەدنەقی شیعرەکەو نوکتەکەی دەدۆڕێت . وشەی ( تور ) هەم بە واتای (تۆ) و هەم بە واتای ( تووك ) دێت ، دیارە رووی یارەکەی دوای سالێك ( تور ، تووك ) ی لێ‌هاتووە پێی رەش بوە .

بە هەمە حاڵ ئەم لابازە ئەگەر پێوەندیشی بە بنگەی نووسینەکەمەوە نەبێت زیانێکی تێدا نییە . با بگەرێمەوە بۆ ( حەشرەکەو ئەهلی خەبەردکە ) لە ( دیوانی کوردی ) دا کە خوالی خۆشبووی گیوی موکریانی بڵاوی کردۆتەوە ئەم دوو بەیتە بەم جۆرە نووسراون : ( بەیتەکانم لە کتێبەکەی دکتۆر کەمالەوە راگوێست )

**خەبەرێکم بدەنێ ئەهلی خەبەر حەشرە مەگەر**
**رۆژکەوا ئەمرۆ لە مەغریب سەری هێناوەتە دەر**
**نوری مەهدی لە تەرەف مەککەوە زاهیربوە یا**
**غەلبەیی کوردە لە بۆ کوشتنی ( من کان کفر )**

نیوە دێڕی یەکەم بەیتی شیعرکان لە ( دیوانی کوردی ) و کە شکۆلی دەسنووسی ( پنهانی ) وەکو یەکن ، هەر دەڵێی گیو لەو کەشکۆلەوە بەیتەکەی راگوێستبێت ، دەمێنێتەوە ئەو جوداوازییەی نێوان وشەی ( غەلەبەی ) کەشکۆلەکەو ( غەلبەیی ) دیوانەکە : کە بگەرێینەوە بۆلای کەشکۆلەکە دەبینین وشەکە ( غلبەء ) نووسراوە ، لەوەوە دەشێ بڵێین گیوی موکریانی ( غەلبەیی ) خوێندبێتەوە منیش ( غەلەبەی ) .

وا دیارە سۆزی کوردایەتی پاڵی بەرەوانشاد گیوەوە نابێتو ئەو غەلبەیەو کافر کوشتنەی پێ‌کردبێتە شاباش‌و بۆ بەر هەنگاری میللەتەکەی خۆی هەڵدابێت ، ئیتر شیعرەکەش واتای دەمێنێ نامێنێ ( ملی‌دەقوتەوە ) .

(١) ئەم وشەیەم بەو شێوەیە نووسی کە لە بەیتەکەدا دەخوێندرێتەوە

# لەڕوانگەی زمانەوانییەوە

# تێڕا

رەؤوف ، احمد ئالان

لە راستەرێوە بۆیبڕۆین باری مێژۆیی لەتەکانی چوارەمیداو لە جەرگەی زەمینەیەکی بە پیتی بەریندا خواستنێکی نەتەوەیی هێناوەتەدی .

ئەویش زمانی ئەدەبیی یەکگرتوی کوردیـــەو میراتێکی هاوبەشی گشت کوردانە ...

لە بەراوردی خۆمەوە ، دەڵێم : ــ

شێوە گەشەسەندوەکەی سلێمانی بێجگـــە لەمەڵبەندە تازەکـــە ــ وشـــەو زاراوەی لـــە دووروونزیکەوە قۆزیوەتەوە ،

لەگەڵ ئەوەشدا بە چـــاکو خراپ تووشـــی سوانەوەو دەنگگۆڕگیو لێقـــرتانو لێزێـــدەکردنو لارەدەنگـــی بووە ، بەتایبەتی لـــە گۆکـــردنو ددانپـــێدانانـــی دەنگـــی « د » دا کـــە بـــە ناوی ئەردەڵانیو گۆرانی کاریگەربووە .. وەك کرکاندنی :ــ

١ ــ لەنێوان [ د ــ ذ ] دا .

٢ ــ گۆڕینی بە [ ی ] نەرم .

٣ ــ شکانەوەی بە [ ا ] ی بزوێن... هتد .

ئەم کارتێکردنە بووەتە هۆی ئاڵۆزی لە هەندێ مۆرفێمدا .. دیاردەیەکەو لەزمانی قسەی شارەکەدا زاڵە ،، ئاڵبەدەستانی زمانەئەدەبیەکە لەمێژە خۆیان پابەنـــدی سەروبەری زمانی قسە نەکردە لەیەکـــەم تەقینەوەی زمانەئەدەبیەکەی « نالی » یەوە ــ واقیع ئەو سرووشەی بە گوێدا داون ، کەدەقە زمانیەکان لە قالبی رەسەندا ــ بەکاربهێنن.. مەبەستم وەستایەتی نیە لە زماندا ، بەڵام لە مەیـــدانی خەملانـــدنو داپینکردندا پێویستە وردبینیی گشتیو تایبەتـــی بکەین ، چونکە هەرچی کوردواتەنیبـــێ ــ ناشـــێ راپێچبکرێتە زمانی ئەدەبـــەوە ، ئەدەبەوە ، لـــەتەك ئەوەشدا نابێ کەرەسەی زمانی نووسین لە جوغزی کوردواتەنی بترازێ .

بە نموونە تاقە مۆرفێمێك بە چەندان قالب لـــە زمانی قسەدا دەردەبڕدرێ تەنها قالبێکیان دایکەیەو لەرووی مۆرفۆلۆژیەوە تۆکمەو تـــەواوە ، تەنهـــا دەسەڵاتمان هەر ئەوەندەیە کەئەو رێژگە رەسەنە لە زمانە ئەدەبیەکەدا بچەسپێنین ، ئەوانی دیکەش لـــە مەیدانی قسەدا چۆن دەردەبڕدرێن لەوزەی بەربەست کردنمانین .

لەئەم مەیدانەدا بێدەربەستیمان پێوەدیـــارە ، شەقلی زمانی قسەو تێکەڵە [ زیاد لە پێویست ] باڵی بەسەرداڕشتنی ئەدەبیماندا کێشاوە !

**بۆ ئەمجـــارە تەنیا لـــە گرێناوەڵکردار = پریپۆزیشنی « تێ ... دا » دەکۆڵمەوە ..**

**ئامرازی « تێ » وەك ئامرازە ئاوەڵکرداریەکانی [ لە ، بە ، پێ .... ] سەر بە رستەسازین ،ئەمیش پاشکۆی « ـ دا » وەردەگرێ .**

هەندێجار ئامرازی « تێ » بـە بێ پاشـکۆکە دەبێتە بەشی لێکدراو لەگەڵ چـاوگو کرداردا ، وەك :

ـ تێچوون ـ واش‌دەبێ کە لەگەڵ پاشکۆکەیداو بە ئەپساوەیی دەکەوێتە گەردان ، وەك [تێداچووم] .

ئەم لایەنەیانی لە گەرداندا سرکنیە ، بەلام لەگەڵ راناوداو لەرستەدا بارێکی ناسکی‌هەیە ... لە زمانی قسەداو بە تاوی دەستەشێوەی ئـەردەلانو برێ ئاخاوتنی شێوەی گـۆران قالبەکە سـواودتەوە و گۆرانێکی بێ ئەندازەی بەسەردا هاتوەو زوربـەی نووسەران قالبە رووخاوەکـان تاودەدەن ، بـەر لەوەی‌کە چەند نموونەیەکی رووخاو بخەمە بەرچاو ، پێویستە بەخواستی وشەسازی ـ شیی‌بکرێتەوە :

أ ـ بەبێ نێو باخەڵکردنی راناو : « تێدا » وەك [ کیسـەکەم هیچـی تێدانیـە ] راناوی « ی » ی بەرکار هەڵچەرخاوەتەوەو لکاوە بە وشەی ـ هیچ ـ ەوە .

ب ـ ئامرازی « تێ + راناو + دا » وەك : ـ

١ ـ تێ + ـی + دا = تێیدا نیە .

٢ ـ تێ + یان + دا = تێیاندا نین

٣ ـ تێ + م + دا = تێمدا نیە .. هتد .

ئەم گەردانە بە دروستی لە کرمانجیی سەرووداو لەدەستەشێوەکانی سـۆرانو موکریو شارباژێردا پارێزراوە . هەر لە خەیمەگای شارەزووردا « نالی » نەمر ، ئەو قالبە رەسەنەی پاراستوە ، مەگەر بە ـ دەگمەنو بە سواوەیی پەڕیبێتە شیعرەکانیـەوە ، کەواتە بۆ ئەم دەستچنە : ـ

ـ دیوانی[نالی] لێکۆڵینەوەی مامۆسـتا مەلا عەبدولکـەریمو محەمەـــدو فاتیحی کـوڕی ، چاپی ـ ١٩٧٦ ـ لاپەرە ـ ٤٧ ـ : ـ

١ ـ دەسرۆکەیی هەوریی چ حیجابێکە کـە تێیدا شمس فلك الحسن اثارت فتوارت .

٢ ـ لاپەرە ـ ٢١٤ ـ :

حەرفی جەرە [ تیانـدا ] نەماوە ئاوی عەدل هەموو موعەللەق مولفای عامیلی تەقدیر .

لە ئەدەبیاتی سەربەشێوەی هەورامیدا دیسان هەمان رەسەنی پارێزراوە ،

ـ شیرینو خوسرەوی خانای قوبادی ـ

ساغ‌کردنەوەی ( محەمەدی مەلا کەریم ) چاپی ١٩٧٥ لاپەرە ـ ٥٣ ـ :

١ ـ ئەبای خورەم‌کۆ دەبرێ عەجەب تـەور [ تێدا ] ساکن‌بین چەند کەشیش‌و گەور .

٢ ـ لاپەرە ـ ٤٦ ـ :

لـەعلش وێنـەی لاڵ دانەی بەدەخشـان « تێشدا » چەند دانەی مرواریی رەخشان .

تێبینی : لە هەورامیدا راناوی « ی » بە پیتی « ش » دەشکێتەوە ، واتە ـ تێشدا = تێیدا ـ .

ـ لە کرمانجیی سەرووشدا بەئەم تاقە نموونە فۆلکلۆریە وازدە هێنم : ـ

گۆڤاری کۆڕی زانیاریی کورد بەرگ «٢» بەشی یەکەم ، لاپەرە ـ ٧١٥ ـ پرۆفیسۆر ژ حاجی جندی :

« خانی‌بێ باڤۆ کولکشکێ
تێدا دکەن کریتی نی‌بێ مرێشکێ »

ئاوڕدانەوەیەك:

هەروەکو پریپۆزیشنی « تێدا » لە جەرگـەی زمانەئەدەبیەکەوە خۆی داڕشتوە ، هەر بەئەو رەسەنیە وبردی سەرلێوی زۆرینەی کوردانە !

لەگەڵ ئەوەشدا با لایەك لە تێکرووخانی ئـەو ئامرازە بکەینەوە : ـ

١ ـ تیا = تێدا :

أ ـ تێ ـ بووەتە [ت]

ب ـ دا ـ بووەتە [ یا ]

جـ ـ لە دوای دەنگی ـ ت ـ وە ، نیمچە زێڕێ هەیە وەك بنووسرێ — tiya — بە لاتینی

٢ ـ تیایا = تێیدا .

٣ ـ تیای‌دا = تێیدا .

٤ ـ تیایانا = تێیاندا .. هتد .

پوختەی قسە :

لەبەرئەوەی‌کە ئەوقالبـە تێکچوانە لەسـەر باسای وشەسازی گەردانیان پێنەکراوە ، بە لەقیو بە ئالۆزکاوی لـە هێنـانو بردن‌دانو بەهیـچ ـ دەستووریك دابین ناکرێن ! زووربەیان سەر بە زمانی قـەشی نێنو داتاشراوی نووسەرن ..

تەنها بۆ زێدەروونکردنەوە لیستەیەکی سەر زمێریانە ددخەمەروو ، کە دەبوو زاتانە بە سفەتی زمانەوان ئەو قالبە رووخاوانەیان بەکار نەهێنانایە ، خۆیشم تاساڵانی ـ ١٩٧٠ ـ بە لاسایی‌ی زمانی‌قسە قالبی سواوەم بەکارهێناوە کەواتە بۆ ئەم نمایشە :

| زنجیرە | قالبی رووخاو | ل / د | سەرچاوە | نووسەر | قالبی دروست |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | تیانا .. | ٥/٢٤ | دیوانی نالی | مەلا عەبدولکەریم | تێیاندا . |
| ٢ | تیایان.. | ١٤/٤٦ | گۆڤاری کۆڕی زانیاری زمارە « ٥ » | عەلادین سجادی | تێیاندا . |
| ٣ | تیادا .. | ٢١/١١٥ | فیلۆلۆژی‌ی زمانی کوردی | محەمەدئەمین هەورامانی | تێدا . |
| ٤ | تێد | — | ئافاق جامعیە ٨-١٢-١٩٧٧ | د. جەمال نەبەز | تێیدا . |
| ٥ | تیایە | ٢٢/٢٥ | میسباح ددیوان | د. مارف حەزنەدار | تێدایە . |
| ٦ | تیای‌دا | ١٢/٦٥ | پاشکۆی رۆژنامەی عێراق ـ ١٥ ـ | د. ئەورەحمانی حاجی مارف | تێیدا . |
| ٧ | تیا | ٧/٦ | تەفسیری خاڵ | محەمەدی خاڵ | تێدا . |
| ٨ | تیا/بێ | ١٨/٦ | سەرنجی لە زمانی ئەدەبی‌ی یەکگرتو | د. عیزەدین مستەفا | تێیدا/بێ |
| ٩ | تیا/بوو | ٣/١٠٣ | دەستووری زمانی‌کوردی جـ ١ | توفیق وهبی | تێیدا/بوو |

پارەی تەرخان کراوی ساڵانە لە بەشی کشتوکاڵدا بۆ
ناوچەی ئۆتۆنۆمی بەم پێیە بەرزبۆتەوە ساڵی
٩٦٧ تاساڵی ١٩٧٧ لە ٥٧٩ هەزارەوە بووە بە ٤٠ ملیۆن
دیناروڵە ساڵی ١٩٧٩ دا گەیشتۆتە ٤٦ ملیۆن دینار

# له دهفتهری ئهمریدا
# لهگهڵ نالی

٧

دوکتۆر مارف خەزنەدار

کاك عەزیز تازە لە دەرەوەی نیشتمان گەڕابووەوە ، حەوت هەشت ساڵ بۆ خوێندن و کاری زانستی لە هەندەراندا مابووەوە. دەبوو خزم و کەس و کار و دۆست و برادەرانی بە تایبەتی لە هەولێر و سلێمانی و کەرکووك بەسەر بکاتەوە ، چونکە لەم شارانە لە هەموویانا زۆر و کەم ژیا بوو و بیرەوەرییەکی زۆری تێدا بەجێ هێشت بوو .

بەهارێکی درەنگ بوو ، بە یادی بیست ساڵ لەمەوبەر کە قوتابی بوو دە ساڵ پێشی ئەو سەردەمە مامۆستای قوتابخانە بوو ، لە شاری کەرکووك لە جووت حەمامی کۆنەوە بەرەوژوور بە ڕێ کەوت بە ناو بازاڕ بەرەو گەڕەکی ئیمام قاسم ، پێش ئەوەی بگاتە چایخانەی عاشووری بە ناوبانگ لە ڕێی سلێمانی ، بە لای دەستەچەپ لای دایە تەکیەی شێخ خدر . ئەمە تەکیەیێکی بچووك بوو ، خاوەن و مورشیدی ناوی شێخ تەها بوو ، کابرایێکی چەندە بلەی باش بوو ، مەلاو خوێندەواری سەردەمی خۆی بوو و ماوەیێکیش مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بوو ، بەڵام زوو وازی لێ هێنابوو بۆ ئەوەی تەکیەکەی بێ خاوەن نەمێنێتەوە . گوێیێکی مۆسیقی بە هێزی هەبوو ، شیعری کلاسیکیی تەقلیدی دەنووسییەوە ، نازناوی « ڕەهبەر » بوو .

من بەتەما بووم لە پاش هێنانەوە یادی بیرەوەرییەکانم لە منداڵییەوە لەگەڵ ئەم تەکیەیە بۆ ماڵ بچم کە بە تەکیەوە نووسابوو و سەربانیان یەك بوو ، بۆ ئەوەی شێخ بە سەر بکەمەوە و زیارەتی بکەم ، کەچی شێخ تەها خۆی دەرکەوت ، پیری کۆماوەی بە ساڵا چوو ، بەڵام هێشتا لە سەرخۆ بوو.

★ ★ ★

**تەها :**

ڕەنگە وازت لە نالی هێنابێ ، ئەوەی لام وایە بۆ وڵاتی عرووسیات دەست نادا و تۆش ئەوەندە لەوێ ماویتەوە ، لەوانەیە نەوەکو نالی بەڵکو بەلمەبرنجی شارەزووریشت لەبیر چووبێتەوە

**عەزیز :**

مامۆستا حەیفت نەکرد ، من چۆن نالیم لەبیر دەچێتەوە ، نەك لەبیرم نەچۆتەوە ، بەڵکو بە زمانی ئەوروپایی‌یانیش باسی نالیم کردووە ، شیعریم گۆڕیوەتە سەر زمانەکەیان و کتێبم لە سەری نووسیوە .

**تەها :**

ئافەرم ! بەرخوردار بی .

**عەزیز :**

بەڕاستی مامۆستا حەز دەکەم هەندێ لە نالی بدوێین .

**تەها :**

کاکی خۆم ، لەچی نالی بدوێین ، کێ دەڵێ ئێمە نەقلمان پێی دەشکێ ، کێ دەڵێ ئێمە تێی دەگەین ؟.

**عەزیز :**

شتێکی هەر لێ تێ دەگەین ، با کەمیش بێ .

**تەها :**

فەرموو ! .

**عەزیز :**

حەز دەکەم هەندێ لە نالی بدوێین لە ڕووی ژن و ئافرەت و دلبەر و یار و عیشق و دەسبازی و دلداری‌یەوە .

**تەها :**

دیوانی نالی هەمووی هەر ئەمەیە ، هەموو مەعنایێکی دەتووانرێ بە « یار » لێك بدرێتەوە ، وە هەمووشی بە بەڵگە بهێنرێتەوە بۆ خۆشەویستی‌ی یار .

**عەزیز :**

باشتر ، بەمە ماوەی قسەکردنمان زۆر دەبێ .

**تەها :**

ڕاستدەکەی .

**عەزیز :**

مامۆستا زۆر کەس ڕووی ئەم زەوی‌یەی ئێمە لە دلداری ناگەن وەکو ئێمە تێی دەگەین ، ئەو قالبە هونەری‌یانەی لە تەعبیر و وێنە کە شاعیرانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دروستیان کردووە بە تایبەتی شاعیرانی فارس و کورد و هەموو نەتەوە تورکی‌یەکان، ڕووداوێکی نائاسایی و هەندێ جار سەیریشن لای هەندێ ئەقوامی تر .

**تەها :**

چۆن دلداری و ژن و دەسبازی لای ئەو کەسانە نی‌یە ؟ ! .

**عەزیز :**

بێ گومان هەیە بەڵام وەکو ئێمە نی‌یە ، بۆ بەڵگە ئەم ڕووداوە دەگێڕمەوە : لە کۆنگرەی جیهانی‌ی ئەدەبی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات کە لە پاییزی ساڵی ١٩٦٧. لە مۆسکۆ بەسترا ، ڕۆژێك لە کۆبوونەوەیێکی گشتی باس لە ئەدەبی کلاسیکی فارس دەکرا ، لە بەڵگەیێکدا کە ووترا « دڵ و جگەر کراوە بە کەباب بۆ مەزە و بەزم و ڕەزمی ڕەندان » نوێنەران و پسپۆرانی ئەدەبی چین و ڕۆژهەڵات و خوارووی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا دەستیان کرد بە پێکەنین ! دیارە ئەوان مەسەلەکەیان وا وەرگرت کە دڵ و جگەری ئادەمزاد کوت کوت کراوە و لە شیش دراوە و لە سەر ئاگر برژێنراوە ! ئەوان هەقیانە بەڵام باوەڕ ناکەم یەکێکی خەڵکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هەندێ شارەزایی لە ئەدەبی کوردی و فارسی و ورکی‌دا هەبێ بەم جۆرە بیر بکاتەوە . باوەڕ ناکەم مەبەسی نالی لەم شیعرە مانا ئاشکرا و دیارەکە بێ :

**حەنایی کردووە پەنجەی بە خوێناوی دلی زارم**
**ئەمە ڕەنگی شەهادەت بێ کە کوشتەی دەستی دلدارم**

**تەها :**

ئەمە ئاشکرایە ، نالی ئەوەندە حەبیبەی خۆش دەوێ ڕێگەی پێ دەدا کە بیکوژێ و ئەو کوشتنەشی پێخۆشە . ئیتر عاشق بە مانا دەکا بە کوژراو ، کە بکوژرێ دەبێ بە شەهید ، دیارە شەهیدیش پایە و مەقامێکی بەرزی هەیە .

**عەزیز :**

شیعر لە لای نالی شتێکی نهێنی‌یە ، لە دەروونی خۆیەوە دەست پێ دەکا ، ئەو شتەی دەیەوێ باسی لێوە بکا لە پێشانا لە مێشکی‌دا دروست دەبێ ، ئیتر جەوهەری دەرەوە لە تەبیعەت و بیر و خەیاڵ کۆ دەکاتەوە ، بۆ ئەوەی شتەکە ئاشکرا بکا ، زۆر جاریش ناوی شتەکە ناهێنێ ، ئەمە جەوهەر و بنیاد و نوکتەی پێ دەڵێن . شیعری نالی مانایە ، واتە زانینی هەموو ووشەکانی شیعری مەرج نی‌یە شیعرەکە بە تەواوی ڕوون بکاتەوە . شیعری وا لە ئەدەبی کوردی و بێگانەدا هەیە بە زانینی ووشەکان هەموو لایێکی

ئاشکرا و ڕوون دەبێ ، بەڵام لای نالی وا نی‌یە . بۆیە زانینی مانای ووشەی نالی هەنگاوی یەکەمە بۆ تێگەیشتنی . نابینی خۆشی لەم لایەنەوە دەڵێ :

**دەورانی‌یە وەك هێلەکی سەودا سەری گێژم**
**بۆیە بە دەقیقی مەسەلە هەرچی دەبێژم**

**تەها :**

ئەم ئوسلووبە لە دانانی شیعر «سەبکی هیندی» پێ دەڵێن ، هەر وەکو « سەبکی خوراسانی » و « سەبکی عیراقی » ش هەیە .

**عەزیز :**

بەڵێ ڕاستە ، من لە سەر ئەو باوەڕەشم کە نالی یەکەمین شاعیر و دووا شاعیری کوردە کە ئەم ئووسلووبەی هێناوەتە ناو شیعری کلاسیکی‌ی کوردی‌یەوە ، هەتا غەزەلەکانی مەلای جزیری و ئەحمەدی خانیش ناچنە ناو ئەم ئوسلووبەوە .

**تەها :**

ڕەنگە ئوسلووبی ئەمانە زیاتر سەر بە خوراسانی و عیراقی بێ .

**عەزیز :**

دەمەوێ هەندێ بێمەوە سەر کوشتن و خوێن ڕشتن لە جیهانی دلداری‌ی ئەدەبی نالی .

**تەها :**

بەڵێ فەرموو ئەم دێڕە شیعرە :

**دامەنی پاکی مەداری دائیرەی خامەڵ نی‌یە**
**خوێنی مەقتوولانە وا دامانی یاری گرتووە**

**عەزیز :**

بەڵێ ، قەیدی ناکا ، من مەبەسم دێڕێکی تر بیو ، بەڵام ئەم دێڕەش بەلگەیێکی زۆر جووانە ، لێرەدا دلبەر دلدار ناکوژێ ، بەلکو دلدار بە تیری عیشق دەکوژرێ ، یا بە ئاگری عیشق دەسووتێ . ئەو گەوج و نەفامانەی وا دەزانن نالی دلبەر دەکا بە پیاوکوژ زۆر دوورن لە ڕاستی ، نالی سەر بە قوتابخانەیێکی شیعری وایە کە لە پاش داهاتنی ئیسلام ، لە ناو نەتەوە موسوڵمانە هیندۆ ـ ئێرانی و هیندۆ ـ ئەوروپایی و تورکە ـ مەغۆلی‌یەکاندا دروست بوو . ئەمە ئەدگاری تایبەتی‌ی خۆی هەیە ، فەلسەفەی شاعیر لە هەموو غەزەلێك بریتی‌یە لە نوکتەیێك ، ئەو نوکتەیە ڕەمز و موعەمما و لوغزە ، هەموو بزووتنەوەیێکی تەبیعەت بۆ ئەوە بەکار دەهێنێ بۆ ئەوەی ئەو نوکتەیە دەربڕێ .

لەم شیعرەدا پێش هەموو شتێك یاری نالی کوردە و هیچ نەتەوەیێکی تر نی‌یە ، چونکە کەوای لەبەرە ، ڕەنگە کچی نەتەوەی تریش کەوا لەبەر بکەن ، بەڵام کەوای ئەو کچە کوردی‌یە ، واتە ئەو کەوایەی ( مەداری دائیرەی خامەکە ) کە بە کوردی « کۆبە » و « شیرازە » ی پێ دەڵێن ، ئەو تیلمە قوماشە باریکەیە کە لە دیوی ناوەوە لە دەوری کەوای ژنان دەدرێ ، بەزۆری لە خامەك دەبێ . دەڵێ دامەنی کەوای یار کۆبەی خامەکی سوور یا سرکەیی نی‌یە ، بەلکو خوێنی ئەو کوژراوانەیە کە لە ئەنجامی عیشق کوژراوون و دامەنی یاریان گرتووە ، چونکە لە عیشقی ئەودا لە ناو چوون . دیارە ئەوەش دەزانین لە پاش ڕژانی خوین ڕەنگی دەگۆڕێ بە سرکەیی و قاوەیی لە ڕەنگی ئەو خامەکەی لە دامەنی کەوای ژنان دەدرێ .

**تەها :**

ڕاستە ، لێرەدا ( یار ) پیاوکوژ نی‌یە ، بەلکو ئەوەندە جووانە هەزاران هەزار کەس عاشقی بوون ، مەعشوقە نابێ خۆی بە دەستەوە بدا . لەبەر ئەوە ئەم هەموو عاشقانە لە داخی عیشق شەق دەبەن ، یا خۆیان دەکوژن ، یا ئاگری عیشق دەیان‌سووتێنێ . ئەگەر نالی بە پێچەوانە بیر بکاتەوە ، واتە یار بدا بە یەکێك ، عیشقەکە بەتاڵ دەبێ ، لە دنیای هونەر و جووانیش‌دا دەبێ عیشق هەر بمێنێ و بلبل نەگاتە گوڵ . نالی لە سەرانسەری ئەو شیعرەی ئەم بەیتەی تێدایە دەیەوێ بڵێ ئەو یارە ئەوەندە جوان‌و نازەنین‌و بێ هاوتایە دڵی عاشقانی هەموو زەوی داگیر کردووە ، بە مەرجێ نابێ بۆ کەسیشیان بێ ، لەبەر ئەوە لە داخانا دەمرن و دەبێ خوێنیشیان بڕژێ بۆ ئەوەی شەهید بن .

**عەزیز :**

ئەو بەلگەیەی دەمویست بیهێنمەوە بۆ ئەم مەبەسە ئەم دێڕە بوو :

**ئالوودە نەبێ دا بە زەبوون گیری‌یە خوێنم**
**بۆ کوشتنی من دامەنی پاکی لە کەمەردا**

مانای گشتی و ڕووکەشی ئەم دێڕە ئەوەیە کە یار خۆی هەڵکردووە واتە دامەنی خستۆتە کەمەری وەکو ئەو قەسابەی پێش سەر بڕینی مەڕ دامەنی دەخاتە کەمەری یا گیرفانی کەوایەوە و خۆی هەڵدەکا بو سەر بڕینی نێچیرەکە . بەڵام مەبەسی نالی ئەم وێنە ماددی و دیار و بە چاو هەست پێ‌کراوە نی‌یە ، بەلکو نوکتەی بنچینەیی لەم بەیتە و سەرانسەری

شیعرەکە کە یەکێتیی مەلحەمی تێدایە ئەوەیە کە جووانیی یار شتێکی زیندوو و نەمرە ، لە مرۆڤایەتی چۆتە دەرەوە و بووە بە پەری و لە جیهانێکی ڕووحی جاویدانیدا دەژی ، هەرچی نالیشە لە جیهانی « نەبوون » دایە ، واتە گێرمە و کێشە و چەند و چوون لە نێوان « بوون » و « نەبوون » دایە ، یار دەبێ ببێ ، نالی دەبێ نەبێ ، نەك چەقۆ لەدەست گرتن و سەربڕینی نێچیر ( عاشق ) لە لایەن یارەوە .

★ ★ ★

**تەها :**

ئێمە زیاتر مەبەسمان شیعری نالییە لە مەقامی ژن و دلداری و جووانی و دەسبازی و سۆزی بێ پایانی بەرامبەر ئەم ئادەمزادە .

**عەزیز :**

با هەندێ شاگولی جوان لە گولزاری دیوانی نالی گولبژێر بکەین ، فەرموو غەزەلی :

**ئەمردم من ئەگەر ئەمجارە بێ تۆ**
**ئەچم شەرتە هەتا ئەو خوارە بێ تۆ**
**دەروونم خالییە وەك نەی دەنالێ**
**هەوارێکی چ پڕ هاوارە بێ تۆ**

ئەم غەزەلە دە دێڕییە سۆزێکی بە کولی ئەنجامی دوور کەوتنەوەی یارە ، نالی هەموو ژیان لە دلبەردا دەبینێ ، کە ئەوی لێ دوور بێ مانای مانای ئەوەیە لە ژیان بێ بەرییە .

**تەهـا :**

پارچە شیعرەکەی تری نالی کە دەلێ :

**دەروونـــم پڕ کەبـــاب و دەردە بێ تـــۆ**
**دلم گەرم و هەناسەم ســـەردە بـــێ تـــۆ**

وەکو تەواوکەرێکی شیعرەکەی پێشووە ، بە تایبەتی دێڕی دووایی :

**بـــەبـــێ دیداری تـــۆ خـــۆ لالە نالـــی**
**عەجەب هەستاوە ئەم چەند فەردە بـــێ تـــۆ**

لێرەدا نالی خۆی سەری سوڕ دەمێنێ ، چۆن توانیویەتی ئەم چەند شیعرە بلێ لەو کاتەی کە یار دوور بوو بێ گومان ئەو لال دەبێ و شیعری بـــۆ هەلناستێ .

**عەزیز :**

بەلێ ! ئەگەر لێرە خـــۆی کردبێ بە لال ، لە جێیێکی تر خۆی دەکا بە خزمەتکار و شا ، خزمەتکاری یار و شای هەموو خەلکی سەر ڕووی زەوی :

**( نالی ) کە غولامی مـــەدەدی زولف بڕۆتـــە**
**شاهێکە لە بن سێبەری بالی دوو هومـــادا**

لەم دێڕەدا نالی مەقامی بەرزی ژن پیشـــان دەدا ، کە ڕەمزی دلدارییە و دلبەری شاعیرە . لە ڕاست دلبەر ناتی غولام و پێش خزمەتە ، بەلام لـــە ڕاست هەموو خەلکی تر شایە . لەوە گەورەتر هەیە کە پیاو شای گشت خەلك بێ و غولامی دلبەر بێ ؟ ! هەموو جووانکارییەکەشی ئەوەیە کە زولف و برۆی یاری کردووە بە بالندەی هوما ، ئەو بالندەیـــەی سێبەری بەختیاری و کامەرانی دێنێ و لە سەر هەر کەسێك بنیشتەوە دەبێ بەشا .

**تەها :**

لەشیعرێکی تردا ، دیسانەوە خۆی دەکا بـــە « نەبوو » ، بەلام بە شێوەیێکیتر وێنەی ئەم خەیالە دەگرێ :

**سەر بەردەبازی ڕێتە ، تەن تەختەبەندیجێتە**
**دل مەیلی خاکی پێتە ، ڕووح مالی خۆتە بیبە**

نالی خۆی دەکا بە مولکی دلبەر ، نەك تەنیا وەکو گیان لەبەرێك بەلکو وەك شتێکی بێ گیانیش ، خۆشەویستی و توانەوەی لە ناو یاردا دەگاتـــە ڕادەیێك کە بەوە ڕازی ببێ سەری بکرێ بە بەردەباز و لەشی بکرێ بە تەختەبەندی ژێر نوێن بۆ ئـــەوەی مەعشووقە بەسەری باز بدا یا لە سەری بخەوێ ، دلیش هەر لەو کاتەدا لە خۆشیدا دەبێ کە لە ژێر پێی یاردا بپلیشێتەوە ، هەرچی گیانیشە لە یار زیاتر کەس خاوەنی نییە .

**عەزیز :**

ساکارانە و بە شێوەیێکی فۆلکلۆرییانە ، وەکو چۆن دایکێك بە کۆرپەی بلێ : « بە قوربانت بم ! » بەم جۆرە نالی خۆی بە قوربانی یاری خۆشەویستی دەکا :

**خۆم قوربانی سەرو دەسمال و دوگمەی کردووە**
**خۆم بە قوربانی دووچاوی پڕ لە سورمـــەی کردووە**

سەر و دەسمال و دوگمە ، ئەوە پیشان دەدا کە ئەو کچەی نالی خۆی بە قوربانی دەکا ، بە ئەتەوە کچە کوردە و خەلکی ناوچەی سلێمانیشە ، ئەگەر لە سلێمانیش نەبێ لە سەر دەستووری سلێمانییە نالی خۆی بە قوربانی ئەو سەر و دەسمال و دوگمە ڕەنگینە

دەکا ، هەروەها ئەو چاوە جوانە بە کل ڕێژراوە . .
گەورەیی نالی لەودایە کە لە کن یار بچووک بێ .

**تەها :**

بەڵام ئایا ئەم دێڕە ساکارە وەکو خۆت ووتت ، بۆ نالی دەست دەدا !

**عەزیز :**

کێ دەڵێ دەبێ شیعری نالی هەمووی داخراوو ڕەمز و ئیشارات و مەعنەمما بێ ! ئەم وێنەو مانا ساکارانە دەسەڵاتی شیعری نالی بە هێزتر دەکەن . نابینی لە شیعرێکی تریدا دەڵێ :

**پێم گوت : مەکە چاک چاکم ، پێش خزمەتی زۆر چاکم**
**فەرمووی بە سەری کاکم ، داغت لە دڵم دایە**

ئەمە نەوەکو تەنیا شیعرێکی ئەوەندە بەرزی ئەو ئوسلوبەیە کە ( سەهلی مومتەنیع ) ی پێ دەڵێن، بەڵکو یەکێکە لەو شاکارانەی یەکێ لە ئەدگاری ڕەووشتی کوردەواری بە هوشیاری قۆستۆتەوە . . خۆشەویسترین کەس لای کێژۆڵەی کوردەواریی لای خۆمان برایەتی ، بە تایبەتی ئەگەر تاقانە بێ ، سوێند بە سەری دەخوا و کاکەی پێ دەڵێ ، هەتا ئەگەر لە خۆشی بچووکتر بێ . « بە سەری کاکم » تەعبیرێکی نەتەوەیی کوردییە لە سەر زاری کێژۆڵە و کچن عازەبی کورد دەسووڕێتەوە .

**تەها :**

قسەکانت جوانە ، بەڵام ئێمەمانان ئەوەندە لایەنگری ئەم جۆرە شیعرە نین !

**عەزیز :**

بەڵێ ئەوە ڕاستە ، ئێوەش زەوقی تایبەتیی خۆتان هەیە ، بەڵام مەبەسی من ئەوە نییە ، بەڵکو ئەوەیە کە نالی شیعری لەم بابەتەشی هەیە .

**تەها :**

بەڵێ هەیەتی .

**عەزیز :**

بۆ زیادە ، دەتوانین لەم باسە نەچینە دەرەوە ، بە شێوەیێکی فراوانتر بیر و ڕای نالی لە بابەت مێینە و ژن و یار و دلبەر و خۆشەویست پیشان بدەین ، بەڵگەشمان ڕەمزی وێنەی ساکاری هونەرییە لە لای نالی ، بەڵام ژیر و وەستایانە ، ئەوەتە لەم دێڕە شیعرانەدا کە دەڵێ :

**دەمێکە وا لە سەر یەک پێ دەسووتێم**
**لە شەوقی تۆ بە میسلی مۆم و هەر مام**
**وەرە قوربان بە جان هەر دوو برا بین**
**کە تۆ بێ مادەر و من بێ پەدەر مام**
**بەڵا گەردانی باڵات بم ئەگەر چووم**
**فیدای هیندوویی خاڵت بم ئەگەر مام**

مەبەسی ئەوەیە کە وەکو مۆم وایە ، هەمیشە دەسووتێ ، بەڵام وەکو مۆم قەت تەواو نابێ ، مۆم ئەگەر بسووتێ لە پاش ماوەیێک تەواو دەبێ ، بەڵام نالی کە بووە بە مۆم تەواو نابێ ، چونکە شەوقی لە خۆشەویستەکەی وەردەگرێ ، یا خود لە بەر ئەوەی خۆشەویستەکەی هەمیشەیی و نەمرە و شەوقیشی هەیە ، بۆیە نالی وەکو مۆم شەوقی جاویدانی لەو وەردەگرێ و تەواو نابێ .

لە دێڕی دووەمدا دەیەوێ خۆی و دلبەرەکەی بکا بە خوشک و برا ، بە وێنەیێکی هونەری زۆر جوان ، خۆشەویستەکەی بێ دایکە ، خۆشی بێ باوکە ، ئەگەر ببن بە خوشک و برا هەردووکیان باوک و دایکیان دەبێ .

لە هەموو بارێکیش دا خۆی بە قوربانی دەکا ، لەوێ بێ یا لەوێ نەبێ ، ئەگەر لەوێ نەبێ خۆی بە قوربانی قەد و باڵای دەکا ، ئەگەر لەوێش بێ خۆی بە قوربانی خاڵی ڕەشی دەکا .

* * *

**تەها :**

نالی وەستایێکی گەورەیە .

**عەزیز :**

مامۆستا ، هەندێ جار وا بیر دەکەمەوە کە نالی هەموو شیعرێکی خوێندبێتەوە بەو زمانانەی دەیانزانێ ، مەبەسم هەموو شیعری ئەو زمانانە لە یەکەم شیعریانەوە تا شیعری شاعیرانی دەوروبەری نالی . بەلای منەوە دوو شتی لەمە قازانج کردووە ، یەکەمیان ، شارەزایی تەواوی لە شیعردا پەیدا کردووە ، دوومیان ، ئەوەی ئەوان ووتوویانە نەیووتۆتەوە . بۆ بەڵگە شاعیران دڵیان بە جێگە و مەڵبەندی هەستی دڵداری و خۆشەدیستی دا ناوە ، لای نالیش ئەمە هەیە ، بەڵام ئەو هاتووە خەیاڵی تازەی دروست کردووە و جێگەی یاری لە دڵەوە گوواستۆتەوە ناو چاو :

**تۆ کە حۆری وەرە نێو جەننەتی دیدەم چ دەکەی**
**لەم دڵەی پڕ شەرەر و سـینەیی سۆزانمدا**

نالی دەیەوێ یاسای دڵداری تەتبیق بکـا ، خۆشەویستەکەی حۆری‌یە ، کە حۆری بوو دەبێ لە بەهەشتدا بژی ، بەهەشتیش دیارە دڵی نالی‌یە ، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو دڵە هەمووی ئاگر وپشکۆ و هاڵاوە ، سنگی برژاوو سووتاوە ، واتە دۆزەخە ، کەوابێ نابێ حۆری لە دۆزەخدا بژی ، بەڵکو دەبێ لە بەهەشت بێ ، بەهەشت چاوەکانی شاعیرە ، لەبەر ئەوە بەهەـشتە چونکە یاری خۆشەویستی پـێ دەبینێ . نالی هەر خۆشی یاسا و دەستوورەکـە بەداهێنان و ووردەکاری‌یەوە تێك دەدا ، بەوەی دڵ کە بەهەشتە دەیکا بە دۆزەخ ، هەموو ئەم بیر کردنەوە و خەیالبازی‌یە لە ناو ئەو جیهانە جووان و نهێنی‌یەی کە « ژن » ی پێ دەڵێن .

**تەها :**

لە دێڕێکی تردا نالی فەیلەسووفانە چاوی دەکا بە مەلبەندی هەمیشـەیی دلبەر :

**وا زەمن مەبە ڕوخسارەیی تۆ غائیبە قوربـان**
**بنوارە چلۆن نەقشە لـە نێو دیدەیی تەڕمـا**

ئەو یارە ئەوەندە لە لای نالی خۆشـەویستە ، نەوەکو هەرگیز ناخی دڵی بەجێ ناهێڵێ ، بەڵکو لـە ناو چاوی فرمێسکاوی نالی نەخشی کێشاوە . هەموو شتێك لە ناو ئاودا ڕەنگ دەداتەوە کـە لە سـەر ئاوەکەوە بێ ، جا لەبەر ئەوەی یاری نالی هەمیشـە لە پێش چاویەتی ئەگەر بە لەشیش لێی دوور بێ بـە گیان هەر لە پێشیەتی ، بۆیە هەمیشـە لە چاویدا ڕەنگی داوەتەوە ، هەروەها لەبەر ئەوەی چاوی نالی هەمیشـە پڕ لە فرمێسکە ، واتە لە هیچ ساتێکدا بێ فرمێسك نی‌یە و ووشك نابێتەوە لە بەر ئەوە هەمیشـە نەخشی لە ناو چاویدا دیارە ، واتە لەگەڵیەتی .

**عەزیز :**

لە کن نالی ، یار نەمرە ، چونکە ئاوی حەیاتە ، خۆشی بە هۆی ئەوەوە نەمرە چونکە لـەو ئاوەی خوواردۆتەوە ، ئەوەی ئاشکراشە تەنیا یەك ئـاوی حەیات و یەك خدری زیندە هەیە :

**لێـوی تـۆ ئاوی بەقـا من خـدرم**
**فـەیزی تۆ ڕەحمـەت و من سەوزەگیـا**

لەم دێرەشێعرەدا نالی خۆی و یارەکـە ی بـە تەواوکەری یەکتری دادەنێ ( لازم و مەلزووم ) . تەنیا یەك کەس ئاوی حەیاتی خواردۆتەوە ئەویش خدری زیندەیە . نالی هاتووە ئاوی حەیاتێکی ترو خدرێکی تری دروست کردووە لێوی مەعشووقە ئاوەکەیـە و خدریش خۆیەتی ، ئەگەر نالی ناویشی خدر نەبووایە هەر دەبوو بە خدری زیندە چونکـە ئاوی لێوی یاری مژیوە کە ئاوی حەیاتە ، بەڵام کە ناویش خدرە ئەوە باشتر چونکە لە ناوشدا لەگەڵ خدری زیندە یەکژی دەگرنەوە .

**تەها :**

بەڵێ ، لە بنجدا لە لای نالی دلداری بریتی‌یە لە ژیان ، ئەو دڵەی دلداری ژنی تێدا نەبێ هەقـی ژیانی نی‌یە .

**ئەگەر دڵ غەیری حوببـی تـۆی تیا بـێ**
**بە دەستی خـۆت دڵـم دەربێنە قوربـان**

نالی بە خۆشەووستەکەی دەڵێ لە ناو دڵیدا جگە لە خۆشەویستی‌ی ئەو هیچی تری تێدا نی‌یە ، ئەگەر شتێکی تری تێدا بێ ، ئەوا دەبێ دڵەکەی لە سنگی دەربێنێ ، کە دڵ لە لەشیدا دەربچێ ، مانای مردنی ئەو کەسەیە ، کەواتە ئەگەر نالی یاری خۆش نەوێ هەقی ژیانی نی‌یە .

★ ★ ★

**عەزیز :**

نالی وەسفی ماددی حـس ئاشکرا و کراوەی ئەندامی لەشی ژنی هەیە ، ئەم جۆرە شیعرە لە کوێ دادەنرێ ؟ .

**تەها :**

شاعیر دەبێ لە هەموو بابەتێك بلێ ، نالی ئەگەر تەنیا شیعری کراوەی بنووسیایە لەوانە بوو ، ئـەو پایەیەی ئێستای نەبووایە ، با هەموو ئەو جـۆرە شیعرانە داهێنانیش بوونایە .

**عەزیز :**

ئەمە ڕاستە ، بەڵام ئایا بە لای نالی‌یەوە زن لەشە یا گیانە ؟ من لەوە دلنیام کە ژن بە لای نالی‌یەوە لەشە و گیانیشـە ! بە چاوی ئەهلی تەریق تەماشای مێینە ناکا ، خۆشەویستی‌ی ئەو تەنیا گیان نی‌یە کە بە ڕاستی لای سـوفی و دەروێشـان مەعشـوقە تەجسید ناکرێ ئەگەر چی هەستی پێ دەکـرێ ، هەروەها تەنیا لەشیش نی‌یە و بە جۆرێك لە هەموو هەستی دەروونی‌یەوە دوور بێ .

**تەها :**

خۆشەویستی نالی جوانێکە خۆشی دەدانە دڵ و ئاگری سۆزی هەڵچوو دادەمرکێنێتەوە . بۆ ئەمە گەڕاوە نوکتەکەی لە ئەندامێکی ژن دۆزیوەتەوە ، ئنجا هاتووە ڕووداو و بزووتنەوەی دروست کردووە بۆ وێنە کێشانی نوکتەکە یا بائەندامەکە بەبێ ئەوەی ڕاستە و خۆ ناوی ببا ، ئیتر ئەمە بووە بە هەڵهێن و لوغز ، ئەمە لای ئەو کەسانەی لە مەعنای قووڵ دەگەڕێن ئەدەبێکی بەرزە ، ئەدەبی خوێندەوار و خاوەن هۆشی و زەوقە .

**عەزیز :**

لەشی ژن لە دیوانی نالی جێگەی دیاری هەیە ، بەڵام بۆچوونەکانی لە سۆز و میهرەبانی و ڕووداو و ڕاستی نەچۆتە دەرەوە . بۆ بەڵگە نالی تەماشای ئەندامی مێینەی ژنی وەکو ئەندامەکانی تری لەش کردووە ، مەبەسم ئەوەیە خۆی لێ لانەداوە بە ناوی عەیب و شەرمەوە ، ڕەنگە ئەمە لە شیعری مەستوورەکەی لە هەموو جێیێکی تری دیوانەکەی ئاشکراتر بێ ، ئەگەرچی لە جێیەکانی تر وەنەبێ کەمتر باسی ئەمەی کردبێ .

**تەها :**

لە شیعری مەستوورەدا بۆ وێنەی تەبیعەت گەڕاوە ، ڕەنگە دووربینی و ووردەکاری و وەستایەتی نالی نەبێ لە شیعردا کەس ئەم وێنانەی بۆ نەدۆزرێتەوە .

**عەزیز :**

بەڵێ ، هەر لە بەر ئەوەشە ئەم وێنانەی نالی بوون بە سەرچاوەی ئیلهام بۆ عەبدوڵڵا بەگی میسباح ـ ددیوان و شێخ ڕەزا و شاعیری تری کورد وێنەی دەسکاری کراوو داهێنراوی تریان لە شیعری کوردی هێنایە ناوەوە لەم بابەتەوە .

**تەها :**

بەلای نالیەوە « عیشق » ڕووداوێکی پیرۆز و نەمرە ، بێ گومان ئەم « عیشق »ە شی لە ژن دیوە ، بۆیە ژن بە لای ئەوەوە پیرۆز و نەمرە .

★ ★ ★

**عەزیز :**

نالی کە باوەڕی بە کردگار بووە ، زیاتر لەبەر ئەوەیە چونکە ژنی دروست کردووە :

**عاشقی سونعی حەقم قوربانی ڕەنگی قودرەتم**
**چاوی ماوی ، خاڵی شین ، کولمی سپی ، زولفی سیا**

نالی لە داهێنانی کردگاردا بۆ دروست کردنی ئادەمزاد گەڕاوە چونکە لە هەموو ڕووداوێك گرنگترە، لە ئادەمزادیش‌دا بۆ چاوی کاڵ و خاڵی شین و کولمی سپی و زولفی ڕەش گەڕاوە ، ئەمانە مایەی جوانی‌ی مەعشووقەن .. واتە نالی عاشقی غەیب و نادیاری نی‌یە ، بەڵکو گرفتاری جوانێکە ئەم هەموو سیفەتە جووانانەی کۆ کردۆتەوە .

**تەها :**

ئێمە کە ئەم شیعرانە وەکو بەڵگە بۆ مەبەسی تایبەتی دێنینەوە ، مەسەلا بۆ مەبەسی ژن و دڵداری، هەر ئەم بەڵگانە بۆ مەبەسی تریش دەس دەدەن . نابێ ئەمەمان لە بیر بچێتەوە .

**عەزیز :**

بێ گومان ئەمە زۆر ڕاستە بە تایبەتی بۆ شاعیرێکی وەکو نالی ، تا مانایێك دەگری سەد مانا لە دەستت ڕا دەکەن ، تارمایی ئەم مانایانە مێشك گوشین و ڕۆژگار و شەونخوونی گەرەکە تاکو هەندێکیان وە دەست دێن ، هەندێکی تریش هەر دەمێنەوە یا خود جارێ دەمێننەوە ، خۆشی هەستی بەوە کردووە ، نابینی خۆی دەڵێ :

**( نالی ) بەداوە شەعری دەقیقی خەیالی شیعر**
**بۆ ئەو کەسە کە شاعیرە سەد داوی نایەوە**

شاعیر لە لای نالی هەموو شتێکە ! ئەدی ئەگەر ئەو کەسە شاعیر نەبێ ، دەبێ نالی چەند داوی بۆ بنێتەوە .

**تەها :**

هەزار داوی بۆ دەنێتەوە .

# دوای خوێندنەوەی کۆمەڵە چیرۆکی

# « بابانۆێل تۆراوە!.. »

● محمد رشید فتاح ●



نامەوێ وەك رەخنەگرێکی ( دەستنیشانکراو ) نە لە نووسەر خۆیو نە لەخۆێندەوارنیش بێمە پێشەوە ، واتە : تا لەتوانای ئەڵەمەکەمدایە تاڵو تفتێکی بێویژدانانە ، یان شەکراوێکی بێویژدانانە بکەم بە گەرووی چیرۆکەکانی کاك ( عەبدوللا عەزیز خالید ) دا . نە خێر بەڵکوو وەك خوێندەوارێکی وا کە لایەنانە حەز بەوە دەکات باری سەرنجی خۆی بەرامبەر بەو کۆمەڵە چیرۆکە دەربڕێت دێمە پێشەوە. .

چەند ساڵێك لەمەو بەر كاك ( عەبدو للا ) وەك چیرۆکنووسێکی لاو هاتە مەیانی چیرۆك نووسینەوە . بەر لە چیرۆکی ( کولەمەرگی ) ـ یەکەی کە چیرۆکێکی درێژبوو ، لە شەستەکاندا بەچەند کورتە چیرۆکێك خۆی بە خوێندەواران ناساند . من بەش بە حالی خۆم دوای لە چاپدانی کۆمەڵە چیرۆکی گڕی کەفە وشکەکانتان دائەمرکێنمەوە ) کە لە ساڵی ( ١٩٧٣ )دا نووسەر بڵاوی کردەوە، وەك نووسەرێکی کورتەچیرۆك بەچاکی نووسەرم ناسی . بێگومان لە ژیانی هەموو نووسەرێکی رەسەندا ، تا لە ژیاندابێت ، بەلای منەوە وایە کە بڕانەوە نیە لە پێشکەشکردنی بەرهەمی ئەدەبیدا مەگەر چەند هۆیەکی تایبەتیو گشتی ی کار نەکاتە سەر ئەو نووسەرە دوای خوێندنەوەی کۆمەڵە چیرۆکە ، ئەو دەمە من بە لای خۆمەوە گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کە هێشتا تەجروبەی چیرۆکنووسی لە

مەیانی چیرۆکنووسیندا وەك پێویست نەگەیوەو ، هێشتا لە سەرەتای ڕێگەدایە . بەڵام مادام نووسەر بێ کۆڵدان ملی ڕێگەی گرتووەو ، دەیەوێ زیاتر هەوڵبدات ، ئەوا بێگومانم پێشدەکەوێتو بەرهەمی چاکترو سەرکەوتوو ترمان دەخاتە بەردەم . وەنە ئەو دەمەش من هەر لە خۆمەوە جەمسەری ئەم رایەم گرتبێ ، ویستبێتم خۆمی پێ ڕازیبکەم ، نەخێر بەلکوو چیرۆکەکانی ئەو دەمەی نووسەر جگە لە کۆمەڵێ شتی رۆژانەی نووسەر خۆی بەولاوە ، شتێکی نوێی نەختنە بەرچاوم . بەڵام نابێ ئەوەش لە بیر بکرێت ، وەك لای زۆربەی نووسەرەکانی تری خۆشمان واهاتووە ، کە هەموو سەرەتایەك بێ کەمو کورتیو ، ناتەواوی کاڵو کرچی ، رەگ داناکوتێ . لەو باوەڕەدام کە هیچ نووسەرێك لای ئێمە ، بەوپەڕی شارەزاییو ، تواناو ا‌ێ هاتوویی‌یەوە نەهاتۆتە پێشەوە .

بەڵام ئەوەتا سالی ( ١٩٧٨ ) مو هەمان نووسەر بە خۆیو کۆمەلە چیرۆکێکی چاپکراوی نوێیەوە ، هاتۆتەوە مەیدانو ، داوا لە ئێمە دەکات ، کە راستو ڕەوان لە بارەی چیرۆکەکانیەوە ڕایەك دەربڕینو ، قسەیەکیان لە سەربکەین ، ڕەنگە ئەو بەلای خۆشی‌یەوە بلێ : ــ نیستام ئەو ساتەی ( مراهقەی ئەدەبیم ) نیەو ، بەوپەڕی دەروون سافیو پێخۆشحالی‌یەوە ، هەموو ڕایەکی بەجێو ، پەسەند وەردەگرمو ، لە ڕێگەبڕینی لەمەودواما ، لەبەر ڕۆشنایاندا هەنگاوی تیژترو ، پێشکەوتوانەتر دەهاوێژم .

چیرۆکنووس لە پێشەکی‌ی کتێبەکەیدا ، لەژێر ناونیشانی ( رووکردنەوە ) دا دەلێ : ــ ( ناکرێت کە بەرهەمی ئەدەبی زادەی رەنگدانەوەی ( خۆخواردنەوەو ، مێشك تواندنەوەو ، سووتاندنە )، بۆ سەردەمی ژانو پەنگ‌خواردنەوەی ئەو (موعاناتە)ی کە هەراساتیان بە مێشکی جەنگاڵو ، وورووژاوی نووسەر هەلگرتووە ، ئەم کۆمەلە چیرۆکە لە زەمینەیەکی تایبەتیو دیاری‌کراوەوە سەری هەلداوەو ، سەردەمی نووسینەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ نیوەی دووەمی سالی ( ١٩٧٧ ) . ئەگەرچی رەنگدانەوەی ناوەڕۆکەکەی بۆسەردەمێکی لەوەوبەرترە .. )

واتە لە سالێكو چەند مانگێکدا ئەم (٩) چیرۆکەی‌نێو ئەم دووتوێی کتێبە لەدایكبوون . نووسەر بە خستنەڕووی ئەم تەمەنە دیاری‌کراوە شتێکی باشی لەگەڵ خوێندەواراندا کردووە ، چونکە لەوانەیە گەر ئەمەی نەکردایە ئەو کاتە ئێمە بەلای خۆمانەوە مێژووی لەدایكبوونی چیرۆکەکانمان بگەڕاتایەتەوە بۆ چەند سالێك لەمەوبەرو ، بە ویستی خۆمان حسابمان بۆبکردنایە . نابێ ئەوەش لەیاد بکەین کە زۆربەی ئەم چیرۆکانە لە رۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یەکاندا لەم دوایەدا بلاوکراونەتەوە .

کەواتە ئەم چیرۆکانە ( موعاناتی ) ئەم‌سەردەمە دیاری کراوەیان بە نێو چەوانەوەیە .

باشە با بزانین چ جۆرە موعاناتێك نووسەری هەراسان کردووەو ، گێنگلی پێداوە .

( تابلۆی دیمەنی خەمبارێکی ئازاردراو ، کاتێ خازە ئەدوێ . هەنسکی شۆخێك . تاوان لە ژێر سێبەری داری زڕا . بابەنۆئێل تۆراوە . پەندەکەی باپیری ، ناپاك ــ خونچە ــ لە دەریای ئازاردا . )

نووسەر وەك چیرۆکنووسێکی واقعی ، موعامەلە لەگەڵ واقعێکی رۆژانەی خۆیدا دەکات . راستە هیچ ناشارێتەوە . ئایدۆلۆژیەتی خۆی بەرامبەر بە ڕووداوەکان نادۆڕێنێ . کتومت بە کامێرای هەستی وێنەیان دەگرێتو ، لەو قالبەشدا کە خۆی قەناعەتی پێیەتی دەیانشواتەوەو ، بە ئاشکرا ددلێت = ــئەوا من شایەتی خۆم بەرامبەر بەو سەردەمە دیاری‌کراوە داو ، ئیتر ئێوە کەیفی خۆتانە ، من شتەکان وادەبینم، ڕووداوەکان بەم جۆرە دەم هەژێنن . وەنەبێ وەك یەکێك لە ئێوە خۆم جیاکردبێتەوەو ، دوورەپەرێز وەستابم ، نەخێر ئێوە منتان جووڵاندووە ، تا بەم شێودیە وێنەتان بکرم .

ئەوەتا لە چیرۆکی یەکەمدا ( تابلۆی دیمەنی خەمبارێکی ئازاردراو . ) نووسەر یەکێکە لەو کۆمەلە تێکچرژاوەی کە چایخانەیەك کۆی کردوونەتەوە . ئەم وەك ڕێبوارێك ڕێی دەکەوێتە ناویانو ، لای ( حەمەئەمین ) دەگیرسێتەوە . دیارە ( حەمەمین ) هاوڕێیەکی کۆنی نووسەرە ، هەرچەندە نووسەر دەستی بۆ ئەمە درێژ نەکردووە . بۆیە وا دەمو دەست دەرگای گفتو گۆی لە گەڵ دەخاتە سەرپشت . چایخانەکە کۆمەلە کەسانێکی هەمە جۆرەی تێدایە ، ( مولتەزیم ) . ( ڕووخاو ) . حەمەئەمین کەسێکی مولتەزیمە . ئەوەتا پەیتا پەیتا

خەفەت بۆ ( قیەم و رەوشـــت و ، گنتو پەیمانی ، لەدەســـتچوو دەخوات . کـــەچی رووخاوەکان بـــە ( جرت )وەلامی دەدەنەوە .
بە لای حەمەئەمینەوە هۆی لەناوچوونی ئەو شـــتە بەنرخانە دەگەڕێتەوە بۆ :

ـ هەمووی هەبوو ، پشـەکە خواردی ! ئـــای پشـە سپلەکە . خوێنەر چاوەڕێی دەوری نووسـەر دەکات . ەچی نووســـەر جگە لـــە کامێرایـــەکـی بێدەنگ کە وێنەی دژبەیەکمان بۆ دەگرێت ، هیـــچ دەورێکی تری نیە . کە دەڵێین چیرۆکنووسی واقعی . دەبێت شارەزایی تەواوی لـــە پەیوەندییەکانـــی کۆمەلایەتی و ، شتە دژیەیەکاندا هەبێت و ، هیچ شتێك بەبێ هـــۆ نەخاتـــە روو . چونکە کـــاری هونەرمەندی واقعی تەنیا وێنە گرتن نیە . بـــەڵکوە پێویسـتە بە چەکی ئایدۆلۆژیەتی خۆیەوە ، کاربکاتە سەر واقعو ، هەوڵێ گۆڕاتیشی بـــدات . نابـــێ نووسـەر بە قسـەی ( قالەی پوورە مەنیج ) کەدەڵێ :ـ ( لێپرسینەوە خۆمان خۆش ! ) هەموو شتێك کۆتایی پێبهێنێو، بێدەنگی خۆی بەو قسانە بکاتە ڕازیبوون. دەبوایە تیشکی سەرنجی خۆی وەك یەکێك لەوان بهاویشتایە سەر قسەکانیانو ، رایەکی دەربڕیایە . چونکە ئەو قسانە هەریەکەیان کۆمەڵێك قسەو باسی بەدوادا دێت . راستە دوای هەموو (پشە خواردنێك) شیرازەی ماڵ دەشێوێت . بەلام گرنگ ئەوەیە هەنا هەتایە .. هەر دەستەوسان دانەنیشین و بلێین :ـ ئای پشە سپلەکە ! .
لە چیرۆکی کاتێ خازە ئەدوێدا
لاوەی کرێکار بە هەر چوار لادا هەڵپەی هارانـــە دەکات . وەك نووسەر دەڵێت :ـ چوار گرێی لە ژیانی داوەو ، چەند هەنگاوێکیشی بەرەو ئامـــانج و خۆناسین ناوە . )

کەچی نەگبەتە تەنیا شڕۆڵی و پەڕپووتییەکەی وای لێکردووە کـــە خەڵکی بەشێتی بزانن و ، بەفیکەو چەپلەلێدان سەری دنیای لێ بهێننەوە یەك .

ئەمیش بە خۆی و بە خەڵکی دەڵێ :ـ نەبێت خەڵکەکە تێمبگەن وەك خۆم خۆم ئەناسم . ) نەبێت بیسـەلێنم نە مێشکم وونکردوەو ، نـــە بیرو هۆشـــم دۆڕاندووە ! )

کەواتە لاوە شێت نیەو ، بیرو هۆشێیش نـــە دۆڕاندووە . تەنیا شڕۆڵیەکەی وای لێکردووە کـــە بیبێتە ( شاذ ). هەرچەندە لاوە خاوەن بیرو هۆشەو ، لە کۆنوە چ جۆرە بیرکردنەوەو ، تێڕوانینێکی بەرامبەر بەژیان هەبووە ، ئیتر هەر ئەوەیەو نەگۆڕاوە . زمانی حالی دەڵێ :ـ ( من هەر ئەوەم کە دەمناسن ! ) کەچی خەڵکەکە هەر بە توێکڵە شووتی شاباشی دەکەن .

بە ڕاستی پیاو پڕ بەدڵ بەزەیی بە لاودی چـــل ساڵ تەمەن و ، خاوەن بیرو هۆشـدا دێتەوە . ئـــەم عالەمە تێکچوون و ، بە خوت و خۆرایی یـــەخـەیان گرتووە . تا خواوراستان ( مام شـەریفی ) گەڕەکی خۆیان فریای دەکـــەوێت و خـــەڵکـــەکـــەی لێدوور دەخاتەود .

سەیر ئەوەیە مام شەریفیش کە دراوسێیانە دەردی لاوەی کلۆڵ نازانێ . تا خازە وەك ( فریادرەسێك ) ددلێ :ـ
ـ دوو مانگە دایکی تۆ خۆش .

کە واتە لێرەدا نووســەر هۆیەکی تری دژبەیەکمان دەخاتە بەرچاو کە دەڵێ ، ـ راستە خەڵکەکـــەش ناهەقیان نییە لەبەر بێدایکی وا بە لاوە ئەکەن .

کەچی لەمەوپێش ئێمە وامان دەزانی هـــەر لەبەر پەڕپووتیو ، شڕۆلی لاوەیە سەریان کردۆتـــە سـەری . باشە لـــە چ کۆمـــەڵێکدا خـــەڵکی لەبـــەر بێدایکی بە توێکڵە شووتی شاباشی کەسێك دەکەن؟.
گەر کەسێك موستەهەقی ئەوە نەبێت ! .
نووسەر لە لایەکەوە هەق بە لاوە دەدات .
ـ راستەلاوە ناهەقی نییە لـــە تاو بێ دایکی وای لێبەسەر هاتووە .

چی لێ بەسەر هاتووە ؟ . خۆ بەلای نووسەرەوە تێکنـــەچووەو ، بەلای ئێمەشـــەوە هیچ هەڵس و کەوتێکی شێتانەی لێنابینین .
لە لایەکی تریشەوە هەق بەخەڵکەکە دەدات کەوا لـــە لاوە ددکەن ! .

ئەم شتە دژ بەیەکانە وامان لێدەگات کە بلێین:ـ لاوە شێتەوە ، خەڵکی لە خۆیانەوە ســـەر ناکەنـــە سەری ! .
لە چیرۆکی هەنسکی شۆخێکدا .
نووسەر لە سەر زمانی هاوەڵێکی خۆی زۆرو جەوری ئاغایەکمان دەخاتە پێشچاو . ( غەریب ) ی تەمەن (٣٠)ی ساڵە (١٦) رۆژە لە گەووڕی وولاخەکانـــی شاسوار ئاغادا خزێنراوە . خەڵکەکەش لەبەر دەرگی گەووڕەکەدا کۆبوونەتەوەو ، نازانـــن غەریب بـــۆ وا

بەم حاڵە براوە . پیاو وا هەست دەکات بە ڕاستی ( غەریب ) بەلایانەوە ( غەریبەو ) . کابرایەکی نەدیوو نەناسیاوە . ئەنیا بۆ دەپرسن :

( ــ لە پیاو کوژو ڕێگریش ناچێ ! . )

خەلکەکە لە هەموو ئاشێك دەکەن . نووسەر سەرکەوتووانە بیروڕای جۆر بە جۆری ئەو کەسانەمان بۆ ئاشکرا دەکات .

هەرچەند غەریب بەندەو ، دوومل هوری ئاغای بە دیارەوەیە بەلام هاوارو دادی خۆی دەگەیەنێتە خەلکەکە .

خەلکەکەش بێدەنگن .

( کەتە ) یەکی پیاوی ئاغا گرێیەکی ڕووداوکە بەم جۆرە دەکاتەوە : ــ ئەوە شێتەکەیە وا دەکات ؟ .

کەواتە غەریب بە لای ئاغاوە شێتە ؟ . غەریبیش وەك ( لاوە ) دەلێ : ــ شێت نیم . هەرچی غەریبە بەلای ئاغاوە کراوە بە شێت . هەرچی لاوەش بوو ، بە لای خەلکیەوە بووە بە شێت .

ــ دوژمینینە منیش نەمێنم بەو ئاوانە گلاوەتان ناگەن.

کام ئاواتە ؟ . نووسەر بە ( مفاجەئەیەك ) گرێ کوێرەی باسەکەمان بۆ دەکاتەوە .

ــ دایکم جوانە .

کەواتە ئاغا لەبەر ئەوە غەریبی کردووە بە شێتو ، ڕەوانەی دەکات . ( ژنەکەی جوانە )

باشە چۆن کوڕەکەی غەریب ، هەر لە خۆیەوە دەلێت: ــ

ــ دایکم جوانە .

ئەمەی چۆن زانێ ؟ لە کاتێکدا دایکیش پێی نەوتووە ، کە مەسەلەکە وایە . دەبوایە نووسەر بە گەڕانەوەیەك، ڕابوردوویەکی ئاغای بۆ نزیك بوونەوە لە خێزانەکەی غەریب بخستایەتە ڕوو . تا ئەوسا ئێمە نەکەوتینایە بەسەر شتێکی کتو پڕیدا . پاشە لەناو ئەو خەلکانەدا نیە کە لایەنگری شەرەفو کەرامەتی غەریبەو ، ژنەکەی بگرێت . بەتایبەتی لە ئاواییەکدا کە خەلکی لەپێناوی شەرەفو ناموسدا هەموو بەرگرییەك دەکەن ،

لەوانەیە نووسەر پێمان بلێ : ــ تارای شەرم . . تارای شەرم وادەکات شتەکە ونبێت .

ئەی باشە بۆ لەو هاوەلەی خۆی نە پرسی : ــ کە کوڕەکەی غەریب پێی وتی : ــ دایکم جوانە ! . تۆ دەورت چی بوو ؟ .

تاوان لە ژێر سێبەری داری زڕا .

لەم چیرۆکەشدا ، خەلکی گەڕەك هەموو بە یەزمەکە دەزانن ، بەلام کەس خەمی نیەو ، هەموان دەلێن : ــ جا چی ئەبێت با ببێت ؟. ( ــ دنیا ئاو ببیات پووشێکی ئێمەی تیا نی یە ! . )

خەرامانی چەوساوە لە پێناوی تولفەکەیدا هەلپەی مەردانە دەکات .

ئەمیش وەك ( غەریب ) دەلێ بەسەرهاتەکەیان یەکە ، هاوارو داد دەباتە بەر خەلکی ، ( ــ بۆ خاتری خوا تولفەکەم فریام کەون ! ) کەچی کەس لای لێناکاتەوە . دەلێ ویژدانو ، مرۆڤایەتی خراوەتە ناو دەریایەکی بێ بنەوە .

خەرامان ئیشی مالان دەکات . کەچی وەك لە زینداندا بەند کرابێت ، هەر هاواریەتی ، ( ــ ماوەم بدەن سەرێکی لێبدەم ، ئای لەم دلّ ڕەقانە . بێگومان نووسەر مەبەستی لەو کەسانەیە کە خوێنی خەلکی دەمژنو ، مرۆڤ وەك ( ئامێر ) سەیر دەکەن .

بەلام‌کارەکەی خەرامان کارێکی سەربەستەو ، لە کارگەیەکدا نی یە ، تا نەتوانێ ئامێرێك جێ بهێلێت .

ــ درۆ دەکەیت . . تولفی چی ؟ ئەمیش وەك درۆکانی ترت .

کەواتە خەرامان بەلای خەلکیەوە بە درۆزن ناسراوە.

باشە کام درۆیانە ؟ . دەبوایە نووسەر درۆیەکی لەوەوبەری ( خەرامان ) ی بخستایەتە ڕوو .

خەلکی لەبەر ئەوەی تا خەرامان لە ساوەر کوتانەکەی نەبێتەوە ڕێگەی نادەن تا بچێتەوە مالەوەو، تولفەکەی ببینێت .

خەرامان ناچار لە مالەکە دەچێتە دەرێو ، خۆی فرێ دەداتە ناو ( زێ ) وە .

دەبوایە نووسەر خاوەن مالەکەی بە مالی ( ئاغا ) یەکی چەوسێنەر دەستنیشان بکردایە . ئەوساکە ڕێی تێ ئەچوو ، کە سەربەستی لێزەوت بکرایە ! . چونکە تا چەوسێنەر نەبێت ، چەوساوە نابێت هەروا بە پێچەوانەشەوە ، هەموو کەسێکیش چەوسێنەر نی یە ! . دوای مردنی خەرامان ئەمجا خەلکەکە دەلێن : ــ

ــ هەموو تاوانبارین .

ــ بێ کەس بوو ، هەژاربوو .

تا کابرایەکی ڕەقەلە وەك دەمڕاستێك ڕوو دەکاتە خەلکەکەو

ـ چەپەلینە ئێوە درۆ ئەکەن ! .

هەرئەویش قفلی دەرگای مالی خەرامـــــان دەکاتەوە . کە دەبینن ، تولفەکەش مردووە .

بەلام مندالێکی زیتەلەی تازە پێگەیشـــــتوو هەلئەداتێ : ـ راست دەکات . واتە کابرای پەقەلە راست دەکات .

کام مندالە ؟ . مندالێکی کام بەرەی خەلکەکە ؟ ئەو خەلکەی کە خەرامانو ، تولفەکەیان لەناوبرد .

یان مندالی ئەو کابرایەی کە دەلێ ' ـ ئـــــەم دیمەنە زیندووە ، تفێکی بێعارانەیە بەنێو چەوانماوە !

نووسەر دەیوایە سیمای مندالە تازەکەی بـــۆ ئاشکرا بکردینایە .

**بابە نۆئێل؛ تۆراوە**

بابە نۆئێل لە کێ تۆراوە ؟ . بێگومان لە شوانەی تەمەن (٤) سالو ، هەتیوکەوتوو تۆراوە .

شوانە لەو تەمەنەدا هەستیارە ئەوە نییە لـــە دایکی دەپرسێ : ـ

ـ ئەوە بۆ چراکە کوژایەوە ؟ .

کام چرایە ؟ . بۆ کوژایەوە ؟. هۆی کوژانەوەی چیبوو ؟ .

کابرایەکی سمێل داتەکاو ئەم گرێیەمان بـــۆ دەکاتەوە .

ـ ئای لەبەر بێباوکی دەردێکی چەند کوشندەو گرانە.

واتە هۆی چرا کوژانەوەکە بێ باوکییە ؟ . گـــەر شوانە هەتیو نەکەوتایە ئەوا چراکە نەدەکوژایەوەو ، بابە نۆئێلیش نەدەتۆرا ! ! .

شوانە لە پرسیاری خۆی ناکەوێت . چونکە چرا هەر کوژاوەیەو ، دیاری بۆ نایەتو ، مالی خواپێداو نییە.

کەچی دایکی پێیدەلێ : ـ ئای رۆژگار نەک بابـــە نۆئێل بەلکو دۆستەکانیش لێمان تۆراون ! .

ـ ئەو زیزبوانە بێبەزەین .

ـ ئەو تۆراوانە بێویژدانن .

خۆزیا نووسەر هێنـــــدە بە ( رەش بینییەوە ) دلی شوانەی نەدەشکانـــدو ، دایکـــەی وەک دایکێکـــی ( هۆشـــمەند )ی وا لێــــدەکرد ، کە بەوپــەری ( خۆشبینییەوە ) هانی شوانەی دەداو ، تینو توانای دەنایە بەرو ، پێیدەوت ! ـ

ـ کورم .. چراکە کوژایەوە .. هەلگیرســـانەوەی بەدەست خۆمانە . زویر مەبە ، بابە نۆئێلیش ئاشت دەبێتەوەو ، تۆش وەک بوویەکی ئەم سەرزەمینـــــە دۆستو کەسو کاری دلسۆزت هەبەو ، بەدەستو دیارییەوە دێنەلات .

**پەندەکەی باپیری .**

پەندەکە چییە ؟ . ( پێویستە پەندو عیبرەت لە رابوردووی دوورو نزیکمان وەرگرین ! ) دورو نزیک دەیان پەندو عیبرەتی لێوەردەگـــیرێت . بەلام کام پەندە ؟ ! .

باپیرم رووی دەمـــی کردە هاوەلەکانـــی .. ( بەگو ئاغا زالمنو خۆپەرست . ) ئەمە راستە . بەلام با بزانین باپیری بەرامبەر بە زولمو زۆری ئەوان چۆن وەستاوە ؟ ! .

لە دەبیستێ بە فرمانی بەگی ناوچەکە براژنو ، منالە وردیلەکانی برازای لە ژوورێکی مالی کوێخای گوندەکەیان توند کراون ، ئەم رووداوە وەک شـێت هاری دەکات . بە خۆی دەلێ : ـ چ رێگەیەک بگرمە بەر ؟ . سەرکەشیی ، یان سەرشۆری .

خەلکی دەیانەوێ رێگەی سەرشۆری پیشانبدەن .

ـ با هەر سەپانیەکەی مالی بەگ قایل بوایە .

ـ قانمیباشە .

بەلام باپیرە بەمە رازی نابێو ، لە گەل هاوەلەکانیـــدا بەرەو مالی ( کوێخا حەمەرەش ) ملدەنێ .

واتە رێگەی سەرکەشیی دەگرێتەبەر .

بەلام شتەکە بە پێچەوانەوە دەشکێتەوە ، یەکێ لـــە هاوەلەکانی باپیرە لە بەرمالی کوێخـــادا هەمـــان بەسەرهاتی باپیرەی لێرووددەدات .

ـ برا سەپانەکەی تۆش بە بەگ رازی نەبوو .. بەگ خەریکە ژنو مندالەکانی شاربەدەر دەکات .

ئەو کاتە ئەمیش هەستبە نەفامیو گەوجی خـــۆی دەکات .

ئەو کاتە ئەمیش هەست بە نەفامیو گەوجی خۆی دەکات .

کە واتە پەندەکەی باپیرە ئەوەیە کە پشت بە هاوەلێ ( ناموافق ) نەبەستین . ئێمە وامان دەزانی باپیرە دەرسی یاخیبوونو ، چۆنێتی دژایەتیکردنی زالمو ، چەوسێنەرمان فێردەکات . کەچی واتەبوو ! . بـــە پێچەوانەوە رووداوێکی تری هەمان رووداوی باپیری لەکن هاوەلەکـــەی دووپات دەبێتـــەوە . دوایش شانازییەوەوە دەکات .

ـ تا تاوانەکە بەســـەرخۆی نەهــــات .. منی بیر نەکەوتەوە . کـــەواتە باپیرەو هاوەلەکەی دوو دنیای

جیاوازن . وا دەزانم لە ڕێگە بڕینشدا قەت ناگەنە یەك . گەر وانەبوایەو ، هاوەڵەکەی لەو جۆرە خەڵکە بوایە کە ڕێگەی ( سەرشۆڕی )یان دەنایە بەر باپیر ، ئەوا ئەم هاوەڵەشـــی ئەم ڕێگە سەختو پـــر مەترسی‌یەی لە گەڵیدا نەدەگرتە بـەر ، بە تایبـەتی ڕێگەی ماڵی بەگو ئاغای زاڵم ! .

## لە چیرۆکی ناپاکدا :

دوو کەس لە بەیانیەکی جەژنا ، دوای گەڕانەوەیان لە گۆڕستانەوە دەچنە میوانی‌ی نووسەر . دوای مشتو مڕێکی زۆر کە زۆربەی قسەکانیان زیادەیە . دەکەونە گێڕانەوەی ئەوەی . کە ئافرەتێك لە گۆڕستانەکە بە عەتفو سۆزی دایکانەی خەمێکی خەست دەکاتـــە میوانی ئەو خەڵکە .

خوێنەر لە ئەنجامی ڕووداوەکەدا دەگاتە ئەو ئاکامەی کە دڵێری جوانەمەرگی ئەو ئافرەتە ڕەشپۆشە بـــە هۆی ناپاکی‌ی هاوەڵێکی‌یەوە سەری تیا چووە .
خوێنەر هەر لە ناونیشانی چیرۆکەکەوە هەست بـە ئەنجامی ناپاکی‌یەك دەکات . بەڵام دەبوو نووســـەر لەبری ئەو ســـەرەتا دوورو درێژی کـــە خۆی‌و ، میوانەکانی‌و ، دایکی‌ی پێوە ماندوو دەکات .بـــە ( ڕاوندباکێك ) ئەوەی بۆ بگێڕاینایەتەوە ، کە دڵێـر چۆن سەری تیاچوو ؟ . ئایا ( غەفلەت ) تووشـــی کردووە ، کە ببێتە هاوەڵی ناپاکێك ؟ . یان شتی تر !. نەك دەرگای ڕووداوەکە وابکاتەوە . کە هاوەڵێتی‌ی ناپاك ئەوە ئەنجامەکەیەتی . چونکە هەموو کـــەس ئەوە دەزانن ناپاك هەر ناپاکە ! .

## چیرۆکی خونچە،

( سیروان )ی هەرزەو دڵبڕاو ، کاتێك لە دەمی پوورە مەنیجەوە ئەوە دەبیستێ کـــە ماڵی خونچـــەی دراوسێیان گەڕاوتەتەوە . ئیتر بۆ چاوپێکەوتنـــی خونچە کێچ دەکەوێتە کەوڵی .
بە دایکی دەڵێت : ــ ئەی نەتزانیوە ماڵی دایکـــی خونچە نەهاتووتەتەوە ؟.
دایکیشی وەك لەو گەڕەکەدا نەبێت .
ــ بە ڕاست دایکی کام خونچە ؟ ! .
هەرچۆنێك بێت سیروان دایکی هەڵئەپێسچێت کـە بچنە سەردانی ماڵی خونچە .
کە دەچنە ئەوێ . دایکی خونچە هەواڵێکی جگەربڕ بە سیروانو دایکی دەدات .
ــ هەفتەی ڕابردوو ــ لە پەڕینەوەی ئاوە خوڕەکەدا لافاو بردوویەتی .
سیروانیش ( هیستریانە ) هاواردەکات
ــ مەرجە ئازداری خونچە گیانی قیبلەم هەرگیز لـە بیر نەکەم .
ئەم هەموو ڕووداوە سەیرانە لەو گەڕەکـەدا ڕووی داوەو ، سیروانو دایکیشی لە بێخەبەران کەشکەك سەڵەوات .
لە کاتێکدا کە خونچە خۆشەویستو هاوەڵی منداڵی‌ی سیروانیشە . دوا چیرۆك **لە دەریای ئازاردا** .
نووسەر لەسەر زمانی ئەودوە بەسەرهاتێکمان بـــۆ دەگێڕێتەوە .
ئەو دەچێت بۆ ئاوخواردنەوە لە مزگەوتی گـەورە . کەچی ژاوە ژاوێك لە دەوری ( مەرقـــەبی ) کاك ئەحمەدی شێخ هەستی بەکێش دەکات . کە دەچێتە پێشەوە . دەبینێ کۆمەڵێ ئافرەتی ڕەشپۆش دەوری قسنەکەیان داوە . کابرای تینوو شـــتی ســـەیر دەبیستێ . ئافرەتێکی جەحێڵ لە جیاتی ئەوەی بۆ تولفەکەی بپاڕێتەوە ، بۆ خۆی هاواری لێ‌هەستاوە!.
خوێنەر دوای کابرای تینوو کەوتووە . دەیەوێ لـە دەمی ئەوەوە شتێك ببیستێ . کـــەچی لە بری ئازارێك هیچی‌تر لە دەمو دووی نابیستین .
تۆ بڵێی ئازاری کابرای تێنو لە دەست ئەو ئافرەتە ( ناواعیانە ) بێت کە داوای شتی مەحاڵ لە (قسنێك) دەکەن ؟ . یان ئازارەکەی بۆ ئەو پیرێژنە جـــەرگ سووتاوەیە کە لە چاوی کوڕەزاکەیدا ، کوڕە کۆچ کردووەکـــەی خـــۆی بە تولفێتی دەبینێ‌و ، بۆی دەپاڕێتەوە ؟ . نازانین . بۆ هەرکامێکیان بێت ، ئەوا کابرای تینوو ، ئازارەکەی وەك سەیرکەرێك شتێکی زیادەیە ! .

## سەرەنجام :

دەڵێم : نووسەر چیرۆك نووسێکی واقیعیەو ، هەموو ئەو ڕووداوانەی کـە بـەم ڕۆژگارە کاریـان تێدەکات . بە کامێرای هەستی وێنەیان دەگرێتو ، بێ‌ئەوەی گوێ بداتە لایەنی هونەری‌و ، تەکنیکی نوێ لە چیرۆك نوسیندا ، مەبەســتی هەرەســـەرەکی‌ی نووسەر ئەوەیە ، ئەو شتەی کە دەیەوێ بیخاتە ڕوو بە هەر شێوەیەك بێت بینووسێت ، هەرچەندە هێندێ

جار هەولێ ئەوە دەدات کە ناوەڕۆکە نوێیەکان لـــە قالبێکی نوێدا داڕێژێت ، بەم سـەرکەوتنی کەمی بەدەست هێناوە . وەك چۆن ناوەڕۆکی نوێ خۆی لە شێوەی نوێدا دەنوێنێت ، بەپێچـەوانــەوە ئـــەم ناوەڕۆکی کۆنی لـــە شێوەی نوێدا دارشتووە .. هەروا بەپێچەوانەشەوە. نووسەر لە گەڵ (تەجروبەی) نووسینی ئەم چەنـد سـاڵەیدا نـەی توانیوە وەك پێویست بەسـەر شێوە نوێیەکـەی چیرۆکی تازەدا زاڵبێتو ، سەرردەمانە بنووسێت . لەوانەیە بڵێ : ئەمە ڕێگەی خۆمەو ، من لەگەڵ ئـەم جۆرە شـێوە نووسینانەدام. بەڵام لە هێندی لە چیرۆکەکاندا ، چەند ناتەواوییەك هەن کەبەلای منەوە پێویستە نووسـەر لەم شێوە نووسینەی ئێستایدا لایەکیان لێبکاتەوەو ، گەر پێی پاش بوون ئەوا با وازیان لێبهێنێ .

١ ــ زۆر جار نووسـەر ڕاناوی بزری ( ئەو ) بەکاردێنێ هەرچەندە کەسی سێیـەمەکـــە ( بزر نییەو ، بەراستی یان گێڕەرەوەیە ، یان پاڵە وانێکی ( حازرە ) . کـــەواتـــە ئەمەســـەرلێتێكدانێك دروستدەکات . وا باشترە ناوی ئەو کەسە خۆی بهێنرێتو ، بەم شێوە نەشاردرێتەوە .

٢ ــ دەبینی کە پاڵەوانێك قـە دەکات لەبری ئەوە ( فاصلە ) بەك بدرێت بە قسەکانی ، کەچی (٢) جار یان (٣) جار داشێك دانراوە بۆ قسەکردنی یەك پاڵەوان ، ئەمەش بێگومان شتێکی نەگونجـــاوو ، نەشیاوە ، من وای بە بە پەسند دەزانم ، نووسـەر لە کاتی وادا (مەتەلۆکێکی) ڕاستەوخۆ ، یان ناڕاستەوخۆ لەنێوانی ئەم قسانەدا تێهەڵکێش بکات سـەرکەوتوو تر دەبێت . ( بێگومان گەر پێویستی کرد . نەك لـە هەموو حاڵەتێکدا . )

لە کاتێکدا شێوەی نوێ لە نووسیندا . ڕستەی کورتو پڕماناو ، برووسکەیی گرتۆتە خۆی ، کەچی نووسەر ڕستەی درێژی ، بە زۆر تێهەڵکێشی وا دروست دەکات ، کە هێندێ جار خوێندەوار وەڕس دەکات . هەرچەندە نووسـەر لە زۆر چیرۆکدا وازی لەمە هێناوە ، بەڵام هێشتا ماوەتی کە بەتەواوی پشت بکاتە ئەمە ، بۆ نموونە ،

(بە دەم کردنەوەی گرێیو باسو بزوا ندنی گرێژەنەی دەرگای هەستو بیرەوە ، لاپەڕە (١٠) .

لـــە ناخی بیری ئاڵۆزییەوە بـــە دوای ســـەرچاوەی هەڵقوڵانی لێکدانەوەی خۆیدا نەگەڕا . لاپەڕە(٢٤). پەڕەی دڵی ( مام شەریف ) ســـەرقاپی خەفەکردنی بەسـەر فنجانی هەڵچووی بیرو هۆشیدا کردو دەستی بەسـەری لاوەدا هێنا ، لاپەڕە (٢٥) .

کێـــردە کولـــەش بـــە ناخـــی قووڵایـــی ڕووداوەکانی ڕۆژانەدا ئـــەچوە خواریو جـــەرگی ڕاستی هەڵئەدڕی ، لاپـــەڕە(٤٣) . با بـــەم چەنـــد نموونـــەیـــە وازبێنین . لـــە گـــەڵ ئـــەمەشـــدا نووسـەر وەکوو هەستی بەم شتە کردبێ کە ئێمـــە خـــتمانە بەرچاو دەبینین ، لە بەکارهێنانی ڕستەی کورتو شیعریی جواندا هەولی بەرچاو دەکەوێت ، حەزدەکەم ئەوەش بەگوێی نووسەردا بچپێنم ، وەك چیرۆك نووسێکی ( واقعی ) با لەمەودوا ( واقعیانە تـــر بنووســێتو ، بـــەرگی ڕەشـــیبینـــی لەبـــەری پاڵەوانەکانی داکەنێو ، لە دەریای ئازارو ، گریانو ، هەنسكو ، کوشتنو بڕینو ، کلۆڵی بیانپەڕێنێتەو تـــۆوی هیـــواو خوشـــــیو ، ســـــەرکـــەوتـــنو بەرەوپێشچوونو ، وڕە بەرز کردنـــەوە ، لـــە زەوی دەروونیاندا بچێنێ .

چونکە نووسەری واقعی ئەبێت هەولی ئەوە بدات کە جیهانی سۆزو عاتیفە بڕووخێنێ .

لە کۆتاییدا هیوادارم کە بەرهەمی داهاتووی کـــاك ( عەبدوڵلا ) لەم بەرهەمەی ئێستای سـەرکەوتوو تر بێت .

**هەموو دڵسۆزو پیاوچاکانی گەلەکەمان داوای سەرکەوتنی هەڵمەتی گشتیی نیشتمانیی لەناوبردنی نەخوێندەواری دەکەن .**



# گۆرانی فۆلكلۆری كاركردن

هیوا عمر احمد

هەموو نەتەوەیەك بە درێژایی ئەو مێژووەی هەیەتی ، وەك گرۆیە مرۆڤ ، كۆمەڵە شارەزایی‌و تاقیكردنەوەو نەریت‌و تێنوارینی فەلسەفی‌و بیروڕاو كەلتورو كەلەپورێكی بە دەست هێناوە لە بوارەكانی رامیاری و وێژەو فەلسەفەو جەنگ‌و ئابوری ، كە وێژدان‌و هەست‌و سۆزو چێژو ژیری‌و رۆشنبیری‌و كارلێكردنی لەگەڵ سروشت‌و تێنوارینی بەرامبەر پەیوەندی‌و كێشەكانی مرۆڤ دەنوێنێ لە لای ئەو نەتەوەیە كەلەگەڵ ژیانیا بەردەوام بووەو وەكووبنەمایەكی زیندوو خۆی نواندووە لە پێكهێنان‌و بەردەوامی ئەونەتەوەیە ، ئەم كەلەپوورەش پێی دەووترێ « فۆلكلور Folklore » . ئەدەبی فۆلكلۆری كوردیش وەكوو هی هەموو نەتەوەیەكی تر ، دەوڵەمەندەو پەلی هاوێژتووە بۆ هەموو لقەكانی‌و ئەمڕۆ سامانێكی نایابی كۆنەكراوەمان هەیە ، یەكێ لەو لقانەی مەبەستمە گۆرانی فۆلكلوری (Folksong) ی‌یەو بە تایبەتیش گۆرانی فۆلكلۆری كار كردن‌و پیشەكان ،

گۆرانی فۆلكلۆری زۆر پێناسەی بۆ دانراوە . « ئەلێكسێندەر كراب » لەم بارەیەوە دەڵێت « گۆرانی فۆلكلۆری كۆیلەیەك هۆنراوەی رەسەن وونی ئاوازدارە ، لەناو نەخوێندەوارەكاندا خولقاوەو تا ئەمرۆكەش زۆری دەماو دەم گێردراوەتەوەو ماوە »(١)

گۆرانی کۆنترین لقەکانی وێژەی فۆلکلۆری‌یە ، زاناکان یەك ناکەون لەسەر باوەڕێ بۆ دیاری کردنی کۆنترین چەشنی گۆرانی ، بە جۆرێ فۆلکلۆر زانەکانی سەر بە فەلسەفەی « ماتریالیزمی » ، گۆرانی کار کردن بە کۆنترین چەشنی گۆرانی دادەنێن (٢) و فۆلکلۆرزانەکانی سەر بە فەلسەفەی « ئایدیالیستی »، گۆرانی ئاینی بە کۆنترین جۆری گۆرانی کە مرۆڤ خۆلقاندبێتی (٣) دادەنێن ، کۆمەڵی سێهەمی فۆلکلۆریستەکان ، گۆرانی خۆشەویستی بە دێرینترین جۆری گۆرانی دادەنێن کە لە شێوەی « بالۆرە » دابوو ..(٤)

زاناکان دووبارە لەسەر ئەوە پێك نەهاتوون کەچ جۆرە گۆرانی‌یەکی کار لەوانی دیکە ، دێرینترە ، بۆ نمونە هەندێکیان گۆرانی گاوانی‌و شوانی‌و کۆمەڵێکی تریان گۆرانی کاری ناو کێلگە بە دێرینتر دادەنێ ، بەڵام ئێمەشن لەگەڵ بیروداگونجاوەکەی دکتۆر عیززەدین مستەفادایین کە دەپرسێ بۆچ گۆرانی میوەچنین بە کۆنترین چەشن دانەنرێ ؟ چونکە قوناغی میوە چنین لە ژیانی مرۆڤایەتیدا لە شوانێتی‌و کاری ناو کێلگەو کشتوکاڵی کردن لەپێشترە ...

هەرچۆنێ ساغ بێتەوە ، دەبێ ئەوە لەیاد نەکەین گۆرانی کەلەپوری کار کردنی ڕەسەن نیشانەو هەیمای قوناغێ ڕەسەنایەتی ژیانی نەتەوەیەك یان گەلێکمان بۆ ئاشکرا دەکات ، ئەم لقەی گۆرانیش وەکوو هەموو لقەکانی گۆرانی فۆلکلۆری چەندان تایبەتی‌و سیفەت‌و خۆمالی هەیە وەك ساکاری ئەو ووشانەی پێ‌ی دەگوترێ‌و زۆربلاوی‌و باوی گۆرانی‌یە کە لەناو خەلکی‌دا ، لێرەدا دەبێ وریابین‌و بە گۆرانی هونەری هاوچەرخەو نەیئالۆزکێنین ، چونکە هەر گۆرانی‌یەك زۆر باوبوو فۆلکلۆری نی‌یە هەروەهادانەری دیارنی‌یە « Impersonal » بە سامانی خەلکەکە دەژمێردێ بە پێچەوانەی گۆرانی هاوچەرخەوە کە خاوەنی ئاوازو هۆنراوەکەی دیارو ناسراون « گۆرانی فۆلکلۆری گەل دەیخولقێنێ ، هەموو گۆرانی‌یەکیش لەناوەندی میللی‌یدا باوبێ بەفۆلکلۆری ناژمێردرێ »(٥)

خۆمالی‌یەکی دیکەی گۆرانی فۆلکلۆری ئەوەیە کە هۆنراوەکانی یان بەشێك لە هۆنراوەکانی لە سەر ئاوازی فۆلکلۆری تر دەگترێ‌و گۆرانی‌یەکی فۆلکلۆری دەخولقێنێ سەر بەخۆیە لە گۆرانی یەکەم بۆ نمونە :

گۆرانی لەسەر ئاوازی یەکەم

**چار جار لە ڕووی ناز بەرکە بەم لاوە**
**وەهام لێ‌مەکە گیانم سووتاوە**
**ماڵمان باری کرد ، کەس نەیگێڕاوە**
**هەرخۆم دانیشتم ، دڵی خۆم داوە**
**باران باریوە ، خەرمانەی داوە**
**ماچێکم پێ‌بدە ، دلەکەم نەماوە**

گۆرانی لەسەر ئاوازی دووەم

**ئەمچی بۆکانی ، زوو بێرە دواوە**
**دڵم بە مۆلەق وەستاوە پاوە ..**
**چار جار لە ڕووی ناز بەرکە بەم‌لاوە**
**وەهام لێ مەکە ، گیانم سووتاوە**
**ئەو بالا بەرزەی‌خدا بە تۆی داوە**
**مەینەتی دونیا هەر بۆ من ماوە**

خۆمالی‌یەکی دیکەی گۆرانی فۆلکلۆری ، خۆ گونجاندنێتی لەگەڵ شێوە زمانەکانی زمانێکدا گەر دەقێك یان چەند هۆنراوەیەکی لەناو چەیەکەوە بچێتە ناوچەیەکی دیکە کە بەشێوە زمانێك بدوێن شێوەزمانی ناوچەی پێشوو نەبێ ... بۆنموونە : ـ

**نە دەنگی بولبولە ، نە چریکەی بازە**
**دەروون خەمبارەو وەتەن بێ نازە**
**سەیری دالانکە ، بێ پاوانە**
**بولبول بێ دەنگ ، وەتەن بێ باوانە**

گۆرانی :

**نە نەوای بلبل ، نەچریکەی بازەن**
**دەروونان خەمبار ، وەتەن بێ نازەن**
**سەیری « دالانێ » پلی پلی بازەن**
**وولات خامۆشەن بلبل بێ سازەن**

گۆرانی فۆلکلۆری کارکردن بە پێ‌ی بەکارهێنانی هێزی ماسولکەیی‌و جۆری کارەکە ، دەگۆڕێ‌و دوو چەشنی هەیە ، یەکەم گۆرانی هەناسە کورت ، کە لەگەڵ موسیقای کارکردنەدا دەگونجێ کە لە ساتێکی کەمدا ، دووبارە ، سوڕی کارەکە دووبارە دەبێتەوە وەك داربڕین لە کاری پیاواندا‌و دەستهاڕی لەکاری ئافرەتاندا جۆری دووەم هەناسە درێژە ئەمیش دیسان لەگەڵ کارکردنەکەداو جوولەی لەش‌و جۆری بەکارهێنانی ووزە دەگونجێ وەك شوانی لە کاری پیاواندا ، مەڕ دۆشین لەکاری ئافرەتانداو درووێنە لەکاری هاوبەشیدا ، دەبێ ئەوەش لەیاد نەکەین کە بابەتی گۆرانی‌یەکە تەنیا ئەو کارە نی‌یە بەڵکوو مێژوو خۆشەویستی‌و نەریتیشی تێکەڵ دەبێت بۆ نموونە : ـ

ـە گۆرانی کێژاندا کەدەچن بۆ لای مێگەل بۆ مەڕ دۆشین لە ڕێگادا کێژێکیان ئەم هۆنراوەیەی خوارەوە بە ئاوازێك دەڵێ و ئەوانی دیکەش بۆی دەڵێنەوە ، بابەتی گۆرانی‌یەکەش هەرچەندە باسی شوانکارەیی و شەنگە بێری دەکات بەڵام باسی دلداری و خۆشەویستیش دەکات :

**پسمامی من شوانکارە**
**سەیرکەن دیارە لەو بنارە**
**شوانکارێکی وورِیایە**
**دلمان بۆ یەك برینداره**

دەتوانین گۆرانی فۆلکلۆری کارکردن بەدوو شێوە پۆلێن بکەین : ـ

١ ـ لەسەر بنچینەی کاری نەژادی وەك بلێین گۆرانی‌یەکانی کار کردنی ئافرەتان و پیاوان

٢ ـ لەسەر بنچینەی کاری تاکی یان کۆمەلی .

پێش ئەوەی بچینە سەر هێنانەوەی چەن نمونەیەك دەبێ ئەوە بزانین ، ئاوازی گۆرانی کارکردن لە جۆرەکانی دیکەی گۆرانی فۆلکلۆریشدا بەکار هێنرێت .

نموونەکان : ـ

١ ـ مەشکەژەندن :

**مەشکە سوورەنەژاوە**
**کەفو کەرەی وەستاوە(٦)**
**کەیبانووی لێ تۆراوە**
**کەیبانو خشتو مشتە**
**پشیلە چاوی لستە**

هەندێ جار بەرامبەرەکەی دەلێ :

**وابە دیم کردی ئەی گولی من**
**مەشکە دەژەنی وەك دلی من**
**کەرەت سەردۆ کەوت ، وەك خەمان**
**خۆتۆ دۆستم بووی ئەی خەنیمی من (٧)**

٢ ـ شوانی : ـ

**( شوانە هەی شوانەی ڕەنجەڕۆ**
**بستێ منداڵ بووم قەولم دا بە تۆ**
**حەوت ساڵ شوانیم کرد تاقەدریان زانیم**
**کاورِێکیان پێ دام هاوار لەبری شوانیم**
**گورگی زالم هاوار لێم بووبە دوژمن**
**کاورِەکەی خواردم هاوارچی بەم بەژن**
**... هتد )**

٣ ـ قەزوان‌کردن : ـ

**ڕۆژی قەزوان کردنە**
**ڕۆژی دوژمن مردنە**
**ڕۆژی ئێمەی گەنجانە**
**ڕۆژی ژوانی یارانە**

کە لە قەزوان کردن دەبنەوە یەکێکیان دەلێت : ـ

**دەکیژان هەستن دێرە**
**شیلانە ، شیرین ، گەنێرە(٨)**
**بابگەینەوە ناو دێ**
**ڕەوتی ئێواران خێرە**

لە ڕێی گەڕانەوەشدا لە گۆرانی ناکەون و دەلێن : ـ

**کۆلمان بەری دار بەنە**
**کاکمان شان بە تفەنە**
**ئەوەی مەردە ڕێبگرێ**
**دەیکەینە باووبەنە**

٤ ـ خەتەنە سوران

منالانی گردبووەوە لە مالی هاورێی خەتەنەکراویان دەلێن : ـ

**ئەم ڕۆ خەتەنە سورانە**
**ڕۆژی ئێمەی منالانە**
**دایەن هەستە شێوکە (٩) ... کاکەی ( حەکیم ) میوانە**

( حەکیم ) باشی بە زمانی گالتەوە کە دێتە پێشەوە لە منالەکە دەلێ :

**خۆ کوڕەکەی ئەمڕۆ گەورەیە**
**بیەم لای کولێرە چەورەیە**
**با کولێرە « حەلاڵ » کەین**
**کابرا ئەو موسەم بەیە**

دایك وەلامی ( حەکیم ) باشی دەداتەوەو بەشداری دەکات : ـ

**کوڕیەم شەش حەوت مانگانە**
**ئەمڕو ڕۆ خەتەنە سورانە**
**خەتەنەی « فیسار » گیانە**

پاش خەتەنەکردن منالان ڕۆلیان دێتەوەو دەلێن : ـ

**« فیسار » خەتەنەکرا**
**بە چەقوان کۆلەوار کرا**
**دەست بەشیو خواردن کرا**
**نزایەك بۆخواکەنا**

٥ ـ مەڕ دۆشی

**٢ ـ گاکەی ئێمە ڕەنگ زەردە**

گوانی پڕ شیر وەك بەردە
کوری مامم شوانمانە
شوانەکەمان زۆر مەردە
۲ ــ پسمامی (۱۰) من شوانکارە
سەیرکەن دیارە لەو بنارە
شوانکارێکی وریایە
دلمان بۆ یەك برینداره
۳ ــ بێریان بەرێژ هەلزنین
بە گوفتی خۆش ، پیکە نین
هەمووی پەری خودایین
پاکیان ژیرن ، هەرژەنین

٦ ــ کار کردنی نێوڕیکا
بە بەفریو بە سەهۆلێ
بەردان دێتم بە کسۆلێ
بۆ ڕیگاکەی بەرمالان
پیا بروا نەرمو نۆلێ

۷ ــ بالۆرەی دۆشاو کردن
کیژانی دۆشاو کەر دەلێن : ــ
بالۆرە بە لێوان
ترێ تە دزە مێوان
ماچ خۆشە لە کێوان
ئای بالۆرە نازانم
قۆخی ناو ڕەزانم
بە دراوان هەرزانم
بە زێران گرانم

۸ ــ شەن کردن
یەکێ لە دایکان بە گەورە کچان دەلێ : ــ
شەن شەن ئەو ڕۆ شەنە
جوانی (( شلێر )) دەگەنە
ئەوەی زوو شەنی بکا
دەیدەمێ بە پیالە خەنە

۹ ــ دەستهاڕ کردن :
کیژان بە نیازتان شادبن
دەستهار کردنە دەستهارە
سەیرێکی ( جوانە ) بکەن
چەندە نازاو بەکارە
چاوی ( نازە ) بەکلە
شتێنی پشتی شلە
سەیری چاپۆکی ناکەن ؟
بۆتە مەلان چقلە

۱۰ ــ کاسەو کەویلەی گلێنە
ئەم کارە کاری تاکە کەسی یە گەر نێر بێ یان مێ
کابرا دەستی لە گلە سورەدایەو دەیبیژێتەوەو دەلێ:ــ
لە گلە سورەی گلێخانە کە
لەو گلەی وەك ئالتونی جوانە
ئەیبیژمەوە بە پێژنگی ورد
چەن ڕۆژ ئەیشێلم بە باشێ
ئەمجا کای ورد وەك ئاوریشم
لەگەلیا تێکەل ئەکەمەوە
لە نزیك پەچەی ڕانەکە
چەن کولێ دێنم بەم زوانە
وەك خەنە وابێ دەست و بك
بۆ ئەوەی نەمێنێ خلتو خاشی
چەن تالەمویەك لەسەر یشم
لە پێستی بزنا ئەیپێچەوە
گابرایەکی تر کە خەریکی گۆزە کردنە دەلێ : ــ
گۆزەی مل بەرزێ دروست ئەکەم
دای ئەنێم لەبەر خۆر تا ووشك ئەبێتەوە
دوای چەن ڕۆژێ ئەچمە وێزەی
بڕوانە چەن جوانە گلێنەو گۆزەی
بەگلە بەران ئەخشیشی ئەکەم
وای لێ دی وەك مس دەزرنگێتەوە
... هەتا دوای ...

**پەراوێزەکان : ــ**

(۱) علم الفولكلور الكسندر كراب ترجمه : رشدى صالح ــ لاپەرە (۲٥۳)
(۲) الاغنية الشعبية الدكتور : احمد مرسى ــ لاپەرە (۳۸)
(۳) ئەدەبی فولکلوری کوردی دکتۆر عیززەدین مستەفا ۱۷۹۰ ــ بەغدا ــ لاپەرە (٥۹)
(٤) سەرچاوەی یەکەم ــ لاپەرە (۲۷۳)
(٥) سەرچاوەی دووەم ــ لاپەرە (۱۰)
(٦) هەندێ جار لەباتی ئەم دێرە دەووترێ « گرۆ گرۆ وێستاوە »
(۷) خەنیمی = دوژمن
(۸) ناوی سێ گولەو بۆ ناوی سێ کیژیش بەکاردێك
(۹) شو = چێشت بەتایبەتـی چێشی بەیانیان و شێوان چونکە چێشتی نیوە ڕۆ « فراقین » ە
(۱۰) پسمام = کوری مام،ئامۆزا... ، چقل = دڕك

# چەپكێ ژانی نەمر.



• محمد سعيد حسن •

لە ناو قەفەزی سینەما ، بولبولێ نیت
تا بۆم بلوێ بەرەڵات كەم
لە ئەلبوومی یادەكانما ، وێنەیە نیت
تا بۆم بلوێ ، بت دڕێنم
لە ڕێگەما ،
دڕكێ نیت چەقی بیتە پێم
تا بۆم بلوێ ، دەرت بێنم
وەك بزمارێ بە گلێنەما چەقیوی‌و خۆشم ئەوێی
وەكوو موچركی ئازارێ ،
بەرەو ناخم دەچیڕیە خوارێ‌و خۆشم ئەوێی
سووره چنارێكی خەمی ،
ڕەگت لە هەموو قوژبنێكی جەستەما
داكوتاوەو خۆشم ئەوێی

وەك ئینسان چۆن لە نیشتمان نابێتەوە
وەكوو حەزو خۆشەویستی
چۆن لە ئینسان نابێتەوە
ئەمن ، لەتۆ جیا ئەبمەوەو
ئەتۆ ، لە من ئەبیتەوە !
وەكوو چەپكێ ژانی نەمر
لە ناو ئینجانەی دڵمایت‌و
لەوەتەی هەم ، لە خوێناوم ئەخۆیتەوە
بۆیە هەرگیز سیس نابیت‌و هەڵ ناوەرێی
بۆیە بەرگەی هەموو پاییزەكان ئەگری
بۆیە وەكوو كام كێو سەختە
لەبەردەمی گەردەلوولا خۆت ڕائەگری
بۆیە ئەوەندەم خۆش ئەوێی . .

چیرۆك بۆ منداڵان

# فاقە

طاهر صالح سعيد



بەفر دەشتو دەری هەموو سپی کردبوو .. ڕیشۆڵەیەك هەستی بە برسێتی کرد .. کەوتە گەڕان بە دووای چەند دەنکە گەنمێکدا .. ئەم لاو ئەو لای کرد .. لەبەر ئەوەی زەوی لەبەر بەفر دیار نەبوو هیچی دەست نەکەوت .. لەدوورەوە ڕەشاییەکی بەرچاو کەوت .. بەرەو پیری چوو .. کەلی‌ی نزیك بووەوە .. لەسەر هەندێك پەین چەند دەنکە گەنمێکی جووانو قەڵەوی دی .. وەك گوڵ گەشایەوە .. نە دەنکە گەنمەکان نزیك بووەوە .. پێش ئەوەی بکەوێتە هەڵچنینیان.. لەدڵی خۆی‌دا وتی « ئەم دەنکە گەنمانە بەخۆڕایی لیرەدا دانەنراون .. هەبێتو نەبێت ئەمە داوە .. لەو داوانەی ڕاوچی‌یەکان .. بۆ باڵندەکانی دائەنێن .. تا بەهۆیەوە بیانگرنو .. بیان بەنو .. بیان خۆن . »

ڕیشۆڵەکە بەئەسپایی .. لە دەنکە گەنمەکان دوورکەوتەوە .. فڕیو لەسەر لقی درەختێکی .. نزیك بەدەنکە گەنمەکان نیشتەوە . برسێتی ئۆری بۆهێنابوو .. ئازاری ئەدا .. بەڵام لەدڵی خۆی‌دا بڕیاری دابوو .. شێرانە بەرگەی ئەو برسێتی‌یە بگریتو .. ملی خۆی نەداتە دەست فاقەکە .

ڕیشۆڵەکە لەسەر لقەکە هەڵنیشتبوو .. لەدوورەوە بینی وا پیرەمێردێك بە کۆمە کۆمەهات .. لە دەنکە گەنمەکان نزیككەوتەوە .. دانەوی‌یەوە .. گەنمو پەینەکەی لابرد .. فاقەیەکی دەرهێنا .. لەناو دەستەکانیا .. فاقەکەی تەقاند . بە بۆڵەبۆڵ گەڕایە دوواوە . دنیا بەرە بەرە تاریك ئەبوو .. هەورێکی توندی هێنا .. بارانێکی بەخور دای‌کرد .. ئەو شەوە تابەیانی خۆشی‌نەکردەوە .. لەبەیانی‌دا پەلە هەورەکان بلاوەیان لێ‌کرد .. بارانەکەچی بەفر بوو تواندبوویەوە .. هەتاو دەرکەوت .. ڕیشۆڵەکە سەر دارەکەی بەجێ هێشت .. ڕووی‌کردە هەر لایەك .. هەر دەنکە گەنمی قەڵەو بوو .. بەتیشکی هەتاوەکە سوور ئەچووەوە.. ڕیشۆڵەکە بەدڵنیایی کەوتە گەنم خواردن. ئەوەندەی خوارد تاقەتی فڕینی نەبوو .. بێ ئەوەی ترسی نە لە فاقە .. نە لە ڕاوچی هەبێت .

# شەوگەر

شیعری

مسعود پەریشان

شەوانە پرچی ڕەشی تۆ
بە ناخی ڕەشایی شەودا
دەچتە خوارێ !
هاڕەی شەوبا ،
لەگەڵ نۆتەی ..
خریتکەی بەرۆکت دەمەژێ
خۆی لە شۆڕەبی پرچتدا
لوول دەداتەو
باڵۆرەیێ ، بۆسانەکانی بێدەنگی
دروست دەکا . !
باڵۆرە سەدای حەیرانە
شتەی سۆڕەبی کوێستانە
هێــدی هێــدی
بە ناخمدا دەچتە خوارێ
تا لەشم جواناوی مەرگ
هەڵ دەڕێژێ

★ ★ ★

هەروەکو کەرویشکە کێوی
هەر حەز بە تەنیایی دەکەی
شەو گەڕی دوای ئەو چاوانەم
کەوا هەر دەم ..
سەوزە ئەستێرەی بێ پەرواى دەر وونمن
بۆم ناگیرێن تاوەکو خۆت ، لەپڕ دێیتەو
چاوەکانی من گر دەدەی

★ ★ ★



کورتە چیرۆک بۆ منداڵان

# وێنەی نەشمیل



سەرتیب محمد امین

هیوا منالیکی کاکۆل قیتی زورجوان بوو ، هەموو کاتی بەیاری کردن لەگەل کچانی گوندەکەدا دەبردەسەر تاوای لێ هات کچان لێی کەوتنە گومانەوە ... بەهانەیان پێ دەگرت
پێیان دەووت :
**کوڕ لەناو کچ عاری بێ**
**جقنەی مامر لە چاوی بێ**
بەڵێ هیوا .. بەم قسانە زور زویر بوو .. روژ لەدوای روژ وایان لێکرد یاری ئیتر نەکات
بەلام ئەو ماوەیەی بەیاری کردن بەسەر بردبوو خولیای نەشمیل کەوتبوە دل کەروژانی چاوشارکێ گری ئەکرد روژ بەروژ تادەهات خوشەویستی لەچاوانیا بەدی دەکرا : وویستی وێنەی نەشمیل لەسەر سنگی بە وێنەی مانگ بکیشێ لەتەکیدا وێنەی شیرو دلیکش !
بۆ ئەم کارەی چوو بۆ لای نەخشین خال پیرەژنیکی بە تەمەن بوو هەر خەریکی خال کوتان بوو لەهەرەتی لاوی خۆیدا
ـ ئەرێ داپیرە. خالبکم بۆ ناکوتی لەسەرسنگم وێنەی مانگ بێ بوو ..
ووتی رۆلە : داپیرە لە دەورت گەرێ تاقەتی ئەوەم نەماوە ..
ووتی : فیرم ناکەی خۆم بی کووتم .
ووتی : هەندێ شیری کچ .. لەگەل هێسی چوای نەوت تیکەل بکە بیکە بەسەر سنگتاو بە دەرزی هاژن هاژنی بکە .
هیوا ئەمەی ئامادە کرد هەر جۆنیکبوو : بەلام لە ترسی دایکو باوکی نەی ئەویرا ئەم کارە بە رۆژ بەجێ بینێ .. شەو هەموو نووستبوون بە ئەسپای چراکەی بەرەوو ئەو ژوورە برد کە شوێن کەتوو ، هیزە رۆنو .. بوو کەوتە کوتای خال .. ئەمەندەی دەرزی دابوو لە سنگ ماندوو بوو بوو ..
وویستی ماندوری بە خەو بتارێنێ .
چراش هەر لە کلپەو هێسی خۆی بوو
... بەیانی هیوا بێ دەنگ بوو ... هیوا چاوەکانی لەروانین بێوەریبوون بەلام سنگی بووبووە شانۆی نەك هەر نەشمیل .. بەلکو ئاسمانی [ مانگیش ] بیش
سەرتیب محمد امین هەمەوەندی

# بارێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

## بەشی چوارەم

بە دوا باسی « ڕێنووسی کوڕ » دا ، بەندی چوارەمی وتارەکەی د. نەبەز بە ناوی « زاراوەکانی کوڕ » دەست پێ دەکات . د. نەبەز لە سەردتای ئەم بەشەدا نووسیوێتی : « یەکەمین هەولدان بۆ دانانی زاراوەی زانستی بۆ زمانی کوردی لە ساڵانی ١٩٥٢ ــ ١٩٥٣ دا دراوە و یەکەمین هەولدان بە کردەوە ئەو فەرهەنگۆکە زانستانەیە کە بۆ کتێبی ( سەردتای میکانیك‌و خۆماڵەکانی مادە )ە لە ١٩٥٧دا تەواو بووە و لە بەهاری ساڵی ١٩٦٠ دا کەوتووەتە بەردەست خوێنەرەوە. هەر پاش ئەمەش بە ماوەیەکی کورت نامیلکەی ( هەندێك زاراودی زانستی ) خراوەتە بازاڕەوە . پاش بڵاوکردنەوەی ئەم دوو بەرهەمە ئەوجا ( نەقابەی مامۆستایانی سلەیمانی ) لەسەر بنچینەی ئەو دوو کارە نامیلکەی خۆی بڵاوکردەوەو ژمارەیەکی زۆر لەو زاراوانەی وەرگرت کە لەو دوو بەرهەمەدا بەکار هێنرابوون یا دانرابوون، بێ‌ئەوەی بە هیچ جۆرێك باسی سەرچاوەکانیان بکات . جا لەبەر ئەودی ( نەقابە ) هێندێك لەو زاراوانەی بە هەڵە وەرگرتبوو ، بێجگە لەوەش ژمارەیەکی یەکجار زۆری ئەوانەی خۆی دروستی کردبوون ، کاڵ‌و کرچ‌و ناشی‌یانە بوون ، ناچار بووم هەڵەکانی لە گۆڤاری ( ڕۆژی نوێ ) دا کە هاوڕێی منالی‌و خۆشەویستم جەمال شالی دەری دەهێنا ، ڕاست بکەمەوە» (ل٩٥). جارێ لەوە نادوێم کە ئاخۆ ئەو فەرهەنگۆکەی د. نەبەز بۆ کتێبی « سەرەتای میکانیك‌و خۆماڵەکانی مادە » ڕێکی‌خستوە ، بە کاری دانانی زاراوە دەژمێررێ یان نا ، چونکە دواتر پێویست ئەو باسە دێنێتەوە گۆڕێ ... ئێستا دەمەوێ هەندێ سەرنج‌و تێبینی دەربارەی ئەو وشانەی نووسەر نیشان‌دەم :

ئەگەر د. نەبەز لەوەدا ڕاستیش بێ کە لە ساڵانی ١٩٥٢ ــ ١٩٥٣ وە خەریکی دانانی زاراوە بووەو یەکەم بەرهەمی لە ساڵی ١٩٥٧ دا تەواو کردوەو پاشان لە ساڵی ١٩٦٠ دا بڵاوی کردوەتەوە، ئەوە هیچ لەوە ناگۆڕێ کە لە باسی کتێبی « سەرەتای میکانیك‌و خۆماڵەکانی مادە » دا ، ساڵی ١٩٦٠ دابنرێ ، چونکە وەك ئاشکرایەو وەك لە هەموو لایەك پەیڕەوی کراوەو دەکرێ، ساڵی لە چاپدان بە مێژووی لەدایك‌بوونی بەرهەم دادەنرێ (٥٧) . بێ‌گومان هەموو کارێك دەست‌پێ‌کردن‌و تەواوکردن‌و لەچاپدانی هەیە ، بە وێنە بەرگی یەکەمی فەرهەنگی خاڵ ساڵی ١٩٦٠ بڵاوکراوەتەوە ، بەڵام وەك مامۆستا خاڵ باسی دەکاو وەك چەند جارێك بە نووسین پەنجەی بۆ ڕاکێشراوە ، دانانی ئەو فەرهەنگە (٢٥) ساڵی خایاندووە . جا بەو پێیە بێ دەبێ ساڵی ١٩٣٥ی بۆ دابنێین . ئەگەر ئەو جۆرە حسابانە ڕاستیش بن ، ئەوە مێژووی زوربەی چاپەمەنی‌یەکانمان بە نائاشکرایی دەمێنێتەوە .

ئەگەر د. نەبەز لەوەدا ڕاست بێ، کە پاش ئەو دوو بەرهەمەی ئەو ( بەتایبەتی دوای نامیلکەی «هەندێك زاراوەی زانستی » )، ئەوجا ئەو زاراوە زانستی‌یانەی لەلایەن نەقابەی مامۆستایانی سلێمانی‌یەوە دانراون ، هاتبنە ئەنجام ، ئەوە تەقدیرەکەی من کە ئەوەی نەقابەم پێش‌خستووە هەڵدەوەشێتەوە . (٥٨) بەڵام بەداخەوە لە وتاری ناوبراوی د. نەبەزدا هێندە بوختان‌و ڕاستی شێواندن بەرچاو دەکەون، کە مرۆڤ لە زۆر شت دەخەنە گومان . بۆ ئەو گومانە پێویست بەوە ناکات بگەڕێمەوە سەر هەموو ئەو بوختان‌و ڕاستی شێواندنانەی پێشتر نیشانم دان ، بەڵکو ئەو نموونەیە بەسە کە یەکسەر بەدوا ئەو وشانەدا کە کارەکەی نەقابەی مامۆستایانی سلێمانی‌یان تێدا دەخاتە پاش ئەوەی خۆی ، وتوێتی : « پاش بڵاوبوونەوەی ئەم دوو بەرهەمە ئەوجا ( نەقابەی مامۆستایانی سلەیمانی ) لەسەر بنچینەی ئەو دوو کارە نامیلکەکەی خۆی بڵاوکردەوەو ژمارەیەکی زۆر لەو زاراوانەی وەرگرت کە لەو دوو بەرهەمەدا بەکارهێنرابوون یا دانراوون ، بێ‌ئەوەی بە هیچ جۆرێك باسی سەرچاوەکانیان بکات » ( ل ٩٥ ) . بۆ ڕەتکردنەوەی ئەم بوختانە پێویست بەوە ناکات کە ئەو بەراوردکردنەی لەنێوان کارەکەی نەقابەو نامیلکەی « هەندێك زاراوەی زانستی » ی د. نەبەزدا کردوومە بخەمە پێش چاو ، بەڵکو تەنیا ئەوە هەموو شت ڕووندەکاتەوە کە ئەگەر د. نەبەز لەمەدا ڕاست

بوایە ، ئەوە کاتی خۆی لەو ڕەخنە توندو تیژو دوورو درێژەدا کە لە کارەکەی نەقابەی گرتبوو (٥٩) دەبوو ئەو گلەیی‌یە بکات .. نەخێر لەو وتارەدا باسی ئەوەی نەکردووە ، بەڵام ئێستا ، واتە دوای تێپەڕبوونی ١٨ ساڵ لەپێناوی خۆپێشخستندا ڕاستی دەشێوێنێ‌و بوختان بۆ نەقابەی مامۆستایانی ئەو دەمەی سلێمانی هەڵدەبەستێ .

جگە لەو بەڵگانە ، هەروەها بە پێویستی دەزانم پەنجە بۆ دوو بەڵگەی‌دی ڕابکێشم :

١ ــ ئەو زاراوانەی نەقابە دایناون پتر زاراوەی ماتماتیک‌و ئەندازەو پەروەردەی نیشتمانی‌و ... ن (٦٠) ، بەڵام ئەوەی کتێبی یەکەمی د. نەبەز فیزیکن جا کە هەر لایەک بابەتیان جیا بێ ئیتر چۆن بڕوا بەو بوختانەی د. نەبەز دەکرێ .

٢ ــ یەکەم لیستەی بەرهەمی نەقابەو هەواڵی کتێبی « هەندێک زاراوەی زانستی » ی د. نەبەز لە ژمارە (٥)ی ساڵی ١٩٦٠ای گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » دا بڵاوکراونەتەوە . کە هەردوو بەرهەم لە یەک‌کاتدا کەوتبنە بەردەست‌و کە بێ‌گومان هەر یەکێکیان ماوەیەکی باش کاریان ویستووە ؛ ئیتر بۆچی د. نەبەز بۆ مەرامی ناڕەوای خۆی ڕاستی دەشێوێنێ‌و چاوی خوێنەر دەبەستێ .

سەرەڕای هەموو ئەوەش ، نووسەر لە بەردەوامی باسەکەیدا دەڵێ : « هەرچی چۆنێک بێ مێژووی ڕاستەقینەی دانانی زاراوەی زانستی لە زمانی کوردی‌دا لەو فەرهەنگۆکە زانستی‌یەوە ، دەست‌پێ‌دەکا کە بۆ کتێبی ( سەرەتای میکانیک‌و خۆماڵەکانی مادە ، نووسراوەتەوە . ( کۆڕی زانیاری ) دەیەوێ ئەم ڕاستی‌یە بشارێتەوەو تێکی‌بداو مێژووی زاراوەی زانستانەی کوردی بە هەڵە پێشکەش خەڵک بکات ، وەک لە وتارەکەی د. ئەوڕەحمان حاجی مارف‌دا دەردەکەوێ کە هیچ باسی ( فەرهەنگۆکی فیزیک )ەکە ناکات » ( ل ٩٥ ) . دیارە د. نەبەز بە زۆرەملێ دەیەوێ ئەو کارەی خۆی بکاتە سەرەتای مێژووی دانانی زاراوەی کوردی . نەک تەنیا بە هیچ نەزانینی ئەرک‌و ڕەنجی خەڵکی جێگەی لۆمەیە ، بەڵکو هێندە خۆپەرستیش باش نی‌یە ...

بەر لە هەموو شتێک فەرهەنگۆکی کتێبی « سەرەتای میکانیک‌و خۆماڵەکانی مادە » بە کاری هەوڵی دانانی زاراوە دانارێ ، چونکە لە نووسین یاخود وەرگێڕانی هەر نووسراوێکدا بۆ سەر زمانی کوردی کۆمەڵێک زاراوە دێتە پێش نووسەر یاخود وەرگێڕ کە دەبێ هەوڵی ئەوە بدەن بەرانبەریان بۆ بدۆزنەوە . هەر بەو جۆرە لە کتێبی « سەرەتای میکانیک‌و خۆماڵەکانی مادە »دا پێویست د. نەبەزی بۆ ئاوڕدانەوە لە زاراوە ڕاکێشاوە .

ئەگەر ئاوڕێک لە پێشەکی کتێبی ناوبراو بدەینەوە ، ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێ کە ئەو کارە هەوڵی دانانی زاراوە نی‌یە : « خوێنەرەوەی خۆشەویست : ئەم کتێبەی وا لە بەردەستتاو باس لە دوو لقی گرنگی فیزیک ئەکا ــ میکانیک‌و خۆماڵەکانی مادده ــ هەر بەو باوەڕە نووسیومەتەوە کە ئێمەش گەلێکین هیچمان لە گەلانی کە کەمتر نیەو ڕۆژێک هەر ئەبێ قوتابخانەی خۆمانەمان هەبێ‌و کەڵک‌و سوود لەم کتێبە ببینرێ . جا هەتا قوتابیانی کورد ئەو ڕۆژە بە چاوی خۆیان ئەبینن، ئەگەر هەر کەڵکێکی زۆریشیان پێ نەبەخشێ ، خۆ ئەوە هەیە ئەبێتە یارمەتی دەرێکیان لە هەڵگرتنی ئەرک‌و زەحمەتی تێ‌گەیشتنی کتێبە عەرەبیەکاندا ...»(٦١) . چۆن وشەکانی د. نەبەز خۆیم کردە بەڵگەی ئەوەی کتێبی ( سەرەتای میکانیک‌و خۆماڵەکانی مادە ) بە کاری هەوڵی دانانی زاراوە دانارێ ، هەروەها لە ڕێگای هەمان نووسراوەوە کە دەڵێ : « ... هاتم بەپێی دەسەڵاتی خۆم چیم پێ کرا کردم . کە ئەوەش داڕشتنی زوربەی ئەو زاراوانە ئەگرێتەوە کە لەم بەرگەدا بەکارهێنراون . ئەو زاراوە بێگانانەش کە بەرامبەری پڕبەپری خۆیانم لە کوردی‌دا دەست نەکەوت ، هەروا بە عەرەبی یان بە لاتینی هێشتمنەوە » (٦٢) ئەوە دەسەلمێنرێ کە پێویست نووسەری بۆ ئاوڕدانەوە لە زاراوە ڕاکێشاوە .

خۆ ئەگەر د. نەبەز ئێستا ئەو چەشنە هەوڵانە بە هەوڵی دانانی زاراوە دابنێ ، ئەوە هەر کارەکەی خۆی بە یەکەم هەوڵ دەرناچێ ، چونکە وەک ئاشکرایە ، بەر لە کاری ناوبراوی د. نەبەز ژمارەیەک کاری زانستی نووسراون‌و وەرگێڕاون . بە وێنە لە کتێبی « دەستووری زمانی کوردی »ی تۆفیق وەهبی‌دا (٦٣) گەلێ زاراوەی زمان بەدی دەکرێن‌و نووسەرەکەی بۆ زوربەیان وشەی لەبارو گونجاوی کوردی داناوە . جا ئەم کارەی مامۆستا وەهبی پتر لە ( ٣٠ ) ساڵ لە پێش ئەوەی د. نەبەزدا نووسراوەو

بڵاوکراوەتەوە .

جا نەك هەر بەر لە کتێبی « سەرەتای میکانیك‌و خۆماڵەکانی مادە » ی د. نەبەزدا ژمارەیەك کاری زانستی نووسراون‌و وەگێڕاون‌و پێویست کێشەی زاراوەی بۆ هێناونەتە ناوانەوە ، بەڵکو هەوڵی سەربەخۆش بە ئامانجی دانان‌و دارشتن‌و دۆزینەوەو هەڵبژاردن‌و وەرگێرانی زاراوە لە زمانی کوردیدا دراوە . بە وێنە « فەرهەنگۆکی زاراوەی جەنگی ڕووسی ــ کوردی » کە ف . نیکیتین ساڵی ١٩١٦ لە ورمێ بڵاوی کردۆتەوە ، « فەرهەنگۆکی زاراوەی زانستی ئەرمەنی ــ کوردی » کە لە لایەن لیژنەیەکەوە دانراوەو ساڵی ١٩٣٥ لە یەریڤان لەچاپدراوە ، لیستەی ئەو زاراوە کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌یانەی جەلادەت عالی بەدرخان لە بەشێکی تایبەتی گۆڤاری « هاوار » دا لەژێر ناوی « فەرهەنگۆك » دا تۆماری کردوون ، ئەو زاراوانەی مامۆستا عەلائەدین سەجادی لە گۆڤاری « نزار » داو هەروەها ئەو زاراوانەی کە لە « گەلاوێژ ، ژین ، دەنگی گێتی تازە ، هەتاو ...»دا خراونەتە بەرچاو خوێنەران ...(٦٤) جا سەرەڕای هەموو ئەوە هێشتا د.نەبەز بێ هیچ سڵ‌کردنەوەیەك، دەڵێ : « هەرچی چۆنێك بێ مێژووی ڕاستەقینەی دانانی زاراوەی زانستی لە زمانی کوردی‌دا لەو فەرهەنگۆکە زانستی‌یەوە ، دەست پێ‌دەکا کە بۆ کتێبی ( سەرەتای میکانیك‌و خۆماڵەکانی مادە » نووسراوەتەوە . ( کۆڕی زانیاری ) دەیەوێ ئەم ڕاستی‌یە بشارێتەوەو تێکی‌بداو مێژووی زاراوەی زانستانەی کوردی بە هەڵە پێشکەش خەڵك بکات : وەك لە وتارەکەی د. ئەوڕەحمان حاجی مارفدا دەردەکەوێ کە هیچ باسی ( فەرهەنگۆکی فیزیك )ەکە ناکات » ( ل ٩٥ ) ... ئەوەیە ڕێزنەگرتنی کارو ئەرك‌و ڕەنجی زانایانی کوردو شێواندنی ڕاستی‌و خۆبەسەندی‌و خۆبردنە پێشەوە ، کە بە داخەوە لە گشت شوێنێکی نووسینەکانی د. نەبەزدا ئاشکرا زەق دێتە پێش چاو ... ئەو هەموو هەوڵەی پێش لەدایك‌بوونی یاخود لە سەردەمی منداڵی د. نەبەزدا دراوە ، بەو شێوە نارەوایە بە هیچ دەزانێ‌و دەیکاتە قوربانی خۆی‌و کەچی هێشتا ئەویش کۆڕو من خەتابار دەکا کە ویستوومانە ڕاستی بشارینەوە . نە بە لای کۆڕەوەو نە بە لای منەوە هیچ گرنگ نی‌یە کێ لە مێژووی دانانی زاراوەی کوردیدا دەست‌پێشکەری کردووە ، چونکە ئێمە لە هەڵس‌و کەوتماندا ڕاستین‌و تەنیا بە مەبەستی خزمەت کار دەکەین ، بۆیەکا هەوڵمان داوە واقیع نیشان بدەین ... سەرەڕای ئەوە ، لە سەرەتای دانانی زاراوەی کوردیدا ئێمە تۆویشمان نەبووە تا شەخسی خۆمان تێکەڵ کەین . جا ئەگەر لە بۆچوونەکەماندا هەڵەشمان کردبێ ، کە بێ‌گومان ڕاست بۆی چووین ، ئەوە بە بێ‌مەبەست بووە ... بەڵام ئەوە ئاشکرا دیارە کە د. نەبەز بۆ هێنانەدی مەبەستی ناپەسەندی ، ئەو بەرهەمانە بە هیچ دادەنێ‌و دەڵێ : « جا ئەگەر بێتو پێش دەرچوونی ئەو ( فەرهەنگۆکی فیزیك )ەو ( هەندێك زاراوەی زانستی ) لەم‌لاو لەولاو لەم فەرهەنگ‌و لەو فەرهەنگدا چەند وشەیەکی زانستانە بە ڕێکەوت لە عەرەبی‌یەوە کرابن بە کوردی ، ئەوانە هیچیان بە ئامانجی دانان‌و دروست‌کردنی زاراوەی زانستانەی فیزیك‌و ماتماتیك‌و گیانەوەرناسی‌و ... هتد نەبوون » ( ل ٩٤ ــ ٩٥ ) .

وەك لەسەرەوە باسم کرد لە ساڵی ١٩١٦دا « فەرهەنگۆکی زاراوەی جەنگی ڕووسی ــ کوردی »و ساڵی ١٩٣٥ یش « فەرهەنگۆکی زاراوەی زانستی ئەرمەنی ــ کوردی » بڵاوکرانەوە . جا ئەمانە نە کاری ڕێکەوتن‌و نە پاشکۆی کتێبن: هەرچی ئەو زاراوانەشە کە لە گۆڤارو ڕۆژنامە کوردی‌یەکاندا بڵاوکراونەتەوە کاری ڕێکەوت نین ... بەڵام چی لە ویژدان دەکەی کە وا بە چاوی سووك تەماشای ئەو هەوڵ‌و تەقەلایە دەکا ... نازانم بۆ دەبێ ئەو کارانە بێ‌ئامانج کرابن‌و ئەوەی د. نەبەز بە ئامانج ؟ یاخود بۆ دەبێ هەر فیزیك‌و ماتماتیك‌و گیانەوەرناسی زانست بن ؟ ...

د. نەبەز لە بەردەوامی ڕێزنەگرتنی ئەو کارە پیرۆزانەداو بەخۆهەڵکوتندا ، دەڵێ : «لێرەدا مەبەستم ئەوە نی‌یە لەسەر کارەکانی خۆم بکەمەوە ، ئەوە مافێکی ڕەوای خۆمەو هەر کەسێك ویژدانی ببێ دان بەوەدا دەنێ ، بەڵام بەر لە هەموو شتێك دەمەوێ ئەوە بخەمە پێش چاو کە کوێر چاوی بە هەوڵ‌و تەقەلای ئەوانە هەڵنایەت کە ساڵان‌و مانگان و لە ڕۆژانی ڕەشدا مازووری کێشانە کاریان کردووە لە پێناوی خزمەتی وشەی کوردی‌دا » ( ل ٩٦ ) . من ڕەخنە لە د. نەبەز ناگرم کە لەسەر کارەکانی خۆی بکاتەوە ، بەڵام ئەمەی ئەو لەسەر خۆکردنەوە نی‌یە ، بەڵکو خۆهەڵکێشان‌و تەفرو توونا کردنی ڕەنجی تێکۆشەرانە .. دیارە د. نەبەز وادەزانێ کە خەڵکیش

هەر بە گەزەکەی ئەو دنیا دەپێون‌و وا ئێ‌دەگا کۆڕیش هەر وەك ئەو ڕێزی ڕەنج‌و بەرهەمی خەڵکی ناگرێ ، بۆیە دەڵێ : « کۆڕ چاوی بە هەوڵ‌و تەقەلای ئەوانە هەڵنایەت ... » ... ڕێ‌کەوتووە کە کۆڕ بە بێ‌مەبەست شتی لەیادکردبێ ، بەلام نرخی هەموو خزمەتێکی لە لا هەیە ... جا د. نەبەز لە ئاسۆگەی خۆپەرستی‌یەوە نەك هەر ڕێزی کۆڕو ئەوانەی لە دانانی زاراوەی کوردیدا کۆششیان کردووە ناگرێ ، بەڵکو لە هەموو سووچێکەوە هەر بەو شێوە نادروستە دەڕوانێ ... بۆ پتر سەلماندنی ئەو وتانەم با ئاوڕێك لە کتێبی « زمانی یەکگرتووی کوردی » بدەینەوە : د. نەبەز لە ( سەرەتا ) ی ئەو کتێبەدا لە باسی ئەو نووسراوانەدا کە دەربارەی زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی بلاوکراونەتەوە ، دەڵێ : « نێزیکەی حەڤدە ساڵ لەمەوبەر ، لە نامیلکەی ( خوێندەواری بە زمانی کوردی ) دا ، زۆر بەکورتی لەم باسە دواوم‌و نەبوونی شێوەیەکی ئەدەبیم بە کۆسپی هەرە گەورەی ڕێی پێشکەوتن‌و بلاوکردنەوەی زمانی کوردی دانا ، پاش بەربەرەکانێی ڕاستەوخۆی زمانەکە .... هۆی ئەم یەکگرتنەو جۆری چارەسەرکردنیشیم ، بەپێی دەسەلات‌و سەرنجی ئەو کاتەم ، زۆر بەکورتی خستە بەرچاو . لەم ماوە دوورو درێژەدا ، چەند باسێکی کەمی لەم بابەتە لەلایەن هێندێ کەسی دی‌یەوە خرانە بەرچاو . بەشێك لەو باسانە زۆر سادەو نەزانانە بوون‌و پێویست بە نێوبردن ناکەن‌و هێندێکی دیشیان تا ئەندازەیەك زانستانە بوون‌و باسکردنیان بە ڕەوا دەزانم بەتایبەتی ئەو کتێبەی کە دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ لە ساڵی ١٩٧١ دا بە نێوی ( سەرنجێ لە زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی )یەوە بلاوی‌کردەوە . هەروەها وتارەکەی مامۆستا تۆفیق وەهبی بە نێوی ( زمانە ئەدەبیەکەمان چۆن تواناو آسانتر بکەین ) لە بەرگی یەکەمی ( گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ) دا ، ١٩٧٢ ، ل ٢٩ ـ ٣٤ » ( ل ٧ ) ... بەر لە هەموو شتێك لەو چەند دێڕەدا دیسان باسی خۆکردن‌و خۆپەسەندی د. نەبەزو ڕێز نەگرتن‌و بە هیچ نەزانینی کاری خەڵکی ئاشکرا دیارە . کاتێ نووسەر دەڵێ : « بەشێك لەو باسانە زۆر سادەو نەزانانە بوون‌و پێویست بە نێوبردن ناکەن » ، دەبوو ئەو سادەیی‌و نەزانانەیی‌یە بخاتە پێش چاوو ئەوجا ئەو حوکمەیان بەسەردا بدا .... خۆ هەرچی کتێبەکەی د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ‌و وتارەکەی مامۆستا تۆفیق وەهبیشە ، وایان دادەنێ کە « تائەندازەیەك زانستانەن » . د. نەبەز کە هیچ نموونەو بەلگەیەکی بۆ سەلماندنی ئەو ڕایەی نەهێنابێتەوە ، ئیتر چۆن خوێنەر بڕوا بەو قسانەی بکا . بێ‌گومان ئەو هەڵسەنگاندنە بێ‌زەمینەیە بە هیچ چەشنێك لە زانستدا جێگەی نابێتەوە ... بەر لە هەموو شتێك د. نەبەز دەبوو بە دوورو درێژی لەو دوو بەرهەمە بدوێ ، ئەوەی باش‌و ڕاستە بە بەڵگەی نوێ پتەوی‌کاو بیچەسپێنێ ، ئەوەی هەڵەشە دووری خاتەوەو ڕای زانستانەی لە جێگە دانێ . بەڕاستی لەم‌بارەیەوە خراپەکاری لەگەڵ کردوون ، بەتایبەتی لەگەڵ نووسراوەکەی د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵی هاوڕێی‌دا ، کە سەرلەبەری هەمان باسەو گەلێ جاریش ڕای وێکچوویان هەیە . جا بۆ دەبێ لەپێناوی خۆ بردنە پێشەوەدا بەوچەشنە بایەخ بەو کارانە نەدرێن کە زووتر کراون ، بەتایبەتی کاری دوو زانای گەورە ، کە گەلێ ڕایان لەوانەی د. نەبەز واقیعی ترو زانایانەترن ...

خۆ ئەوەی لە سەرەتای وتاری ڕەخنەلێ‌گیراودا باسی دەوری خۆی لە وەرگێڕان‌و داڕشتنی زاراوەدا دەکات ، نموونەیەکی زۆر لەبارە بۆ نیشاندانی خۆدەرخستن‌و شاردنەوەی خەڵکی لەلایەن د. نەبەزەوە ( بڕوانە ل ٨٢ ـ ٨٣ ) . لەم شوێنەدا زەق ئەوە دەبینرێ کە د. نەبەز دەیەوێ نیشانی بدا لە دانانی زاراوەو هەوڵ بۆ دامەزراندنی ( کۆڕی زانستانەی زمانەوانی ) دا پێشڕەو بووەو خەڵکیش بەربەرەکانیان دەکرد ... ناوناوەش دەڵێ : « لەبەر ئەوە هەوڵم‌دا چەند برادەرێکی ئەو دەمەی خۆم کە هەموومان لە بەشە زانستی‌یەکانی زانستکەی بەغدادا دەمانخوێند ، وا لێ‌بکەم بۆ ئەم مەبەستە هاریکاریم بکەن . بەکورتی لە هاوینی ساڵی ١٩٥٢ ەوە تا هاوینی ١٩٥٣ کۆمەڵێکی چەند کەسیمان بۆ وەرگێڕان‌و داڕشتنی زاراوەکانی ماتماتیك‌و فیزیك‌و کیمیا دامەزراند » ( ل ٨٢ ) ... « ... کۆمەڵەکە ساڵێك پتر نەژیاو کارێکی ئەوتۆی بەرهەم نەهێنا . بەلام ئەز هەر دەستم هەڵنەگرت » ( ل ٨٣ ). ڕاستە د. نەبەز دەڵێ « چەند برادەرێك » ، بەلام لە هیچ

شوێنێکدا ناوی ئەو برادەرانەی نابا . دیارە تەنانەت نابەوێ میللەت ناوی ئەو زاتانەش بزانێ کە هاوکاری خۆی بوون . جا ئەمەیە چاو بەرایی نەهاتن‌و لەویش زیاتر بێ‌وەفایی . خۆ ئەگەر مەسەلەی چاوبەرایی نەدان‌و بێ‌وەفاییش نەبێ ، ئەوە لەم‌بارەیەوە د. نەبەز هەر جێگەی لۆمەیە ، چونکە نەك خەڵك بەڵکو خۆی ناوی برادەرەکانی کوێر دەکاتەوە ، کەچی خۆی لـە بیر ناکاو لە هەموو نووسینێکیدا بەشێکی زۆری بـە باسی خۆی پڕدەکاتەوە .

سەرەڕای ئـەوە هەر نووسینێکی د . نەبـەز دەگری ، سەرچاوەکانیان هەر بەرهەمەکانی خۆیەتی ، ئەمەش نموونەیەکی‌ترە کە د. نەبەز هەر کاری خۆی پەسەند دەکا .

من گومانم لە دەورو خزمەتـی د. نـەبەزدا نی‌یە ... هەوڵ‌و تەقەلای جێگەی شایانە ، بەڵام خۆزگە لەگەڵ خۆپەسەندی‌دا چاوی لە خزمەتی ئەو خەلکەش دەبوو ... یاخود هیچ نەبێ لە بێ‌ئاگایی قسەی فڕێ نەدەدا ، یاخود بە هەواڵی نـاراسـت هەڵنەدەخەڵەتا ... بەداخەوە هۆ هەرچی‌یەك بـێ کە د. نەبەز وای دەداتە قەڵەم ، ئێمەی فەرمانبـەرانی کۆڕ : بە مووچەی زۆرەوەو لە ژووری گەرمو نەرمدا دانیشـتووین‌و بەردەسـت فڕکان فڕکان چا و قاوە دەهێننە بەردەممانو بە دوکتۆر دوکتۆرو مامۆسـتـا قـسەمان لەگەڵ دەکەن ( ل ٩٦ ) ، ئەوە زۆر بە هەڵەدا چووە ، چونکە قسەکانی زۆر لە ڕاستی‌و واقیعەوە دوورن . هیچ کاتێك ڕووم نەهاتووە باسی مووچەی کەم‌و جێگەی لەقـو ڕەقم بکەم، بەڵام بوختان هێزشی بۆ هێناوم (٦٥) و بەداخەوە ناچارم لەو باسە ناحەزە بدوێم . هەر لەبەرئەوەی فەرمانبـەری کۆڕم‌و هەر لەبەرئەوەی دڵسـۆزانە خزمەتی ئەو میللەتە دەکەم ، دەبێ چەکی ناحەزانی کۆڕ بوختان بێ بە مووچەی زۆرو جێگەی گەرمو نەرم ... ئەگینا ئەو پارەیەی هەر یەکێك لە مامۆستایانـــی زانستگەی بەغـــدا وەری‌دەگرن ، بە لایەنی کەمەوە دوو هێندەی ئەوەی من دەبێ ، وە هەر مامۆستایەکی زانستگەی سلێمانی مووچەی سێ ئەوەندەی مـن دەبێ . بەڵام من گلەیی لەو مووچە کەمەی کۆڕو لەو هەموو کارە زۆرەی کۆڕ ناکەم ، چونکە خۆم ئەم ڕێگەیـەم هـەڵبژاردووە ، ئەگینا مەودا زۆرە بچمە شوێنێکی‌دی‌و مووچەی زۆر وەرگرم‌و کاریش کەمتر بکەم ... بەخوا جێگەشمان

هەتا بڵاوبوونەوەی ئـەو وتارەی د. نەبـەز زۆر ڕەق و تـەق بـوو ... هـەرچی چا و قاوەشـە زۆر کات لێی بێ بەری بووین،یاخود خۆمان لێمان‌ناوە. لەم دواییەدا یەکێك پەیدابوو ئەو کارەمان بۆ ساز بکا ، بەڵام ئەوەی ئـەو دەرخواردمـان دەدا لـە گۆشتاوەکەی کابرا دەچێ ، کـە دەڵێن : ( ئەوەی نەیخوارد پێی ئەمرد ، ئەوەی نەی‌ئەخوارد بـۆی ئەمرد ) ... کەسیش لەم دەزگایە نەك هەر ئارەزووی ئەوە ناکات بە دوکتۆر دوکتۆرو مامۆستا قـسـەی لەگەڵ بکەن ، بەڵکو قینیشی لەو جۆرە پەیوەندی‌یە دەبێتەوە . ئەوەی جارێك هاتبێتە بارەگای کـۆڕ هەستی بە سادەیی‌و لـەخـــۆبوردوویی‌و دڵسۆزی فەرمانبەرانی کۆڕی کردووە . کۆڕ تا ئەمڕۆش ڕەنگە تاکە دەزگا بێ کە بێ ڕاگرتن‌و بێ پرس‌کردن دەرگای خستبێتە سەرپشت . سەرۆکەکانی کۆڕو ئەمیندارە گشتی‌یەکانی کۆڕ هیچ کاتێك نەك هەر سکرتێریان نـەبووە ، بەڵکو وا ڕێکـــەوتووە بەردەستیشیان نەبووە ، بەڵام لە زۆر شوێن بەرێوبەرێکی بچووك چەندین سکرتێرو ... ی هەیە . جا کە ئەمە ڕاستی‌و واقیعی کۆڕو فەرمانبەرانی بێ ، بـۆ دەبێ ئـەو ناڕەوایی‌یەی لەگەڵ بکرێ .

بەداخەوە ، د.نەبەز لە وتارەکەیدا هەر جارە لە بوختانێکەوە هەنگاو هەڵدێنێت بۆ بوختانێکی‌تر . ئەمەش وای لێ‌کردووە بێ‌وچان لە قۆرتێکەوە بکەوێتە قۆرتێکی‌دی . بەوێنە لە لاپەڕە (٨٤)دا نووسیوێتی : « ... هەر لەبەر ئەوەشە ئەو پارە زۆرەو ئـەو چاپخانە نایابەو ئەو کتێبخانە بێ‌وێنەیەی کـۆڕ لەبەردەستیایەتی‌و ئـەو فەرمانبەرو کاربەدەسـتە زۆرەی کۆر هەیەتی ، سوودێکی ئەوتۆیان لـێ نابینرێ» . پێشتر لە بودجەی کەم ( نەك زۆر ) ی کۆڕ دواوم‌و پێویست بە دووپات‌کردنەوە ناکات ... چاپخانـەی کۆڕ هـەتا بەهاری سالی ١٩٧٥ یش هێشتا هەر چاپخانە کۆنەکەی کۆڕی زانیاری عیراقی بوو،کە زۆری پیتەکانی سوابوون‌و مەکینەی چاپەکەش بە تەقەتەقـو بە دەست کاری دەکرد . بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا چەندین کتێبی بەنرخ‌و نایابی پێ چاپ‌کرا . پاش هەوڵ‌و کۆشش ، دوای پاشەکەوت‌کردنی کەمێك پارە مەکینەیەکی ئەنتەرتـایپی ڕیزکردنـی پیت‌و مەکینەیەکی هایدلبرگی چاپ کڕا . کڕینی ئەو دوو مەکینەیەو هەندێ وردە ئامێری‌تر دەورووبەری (٣٠)

هەزار دینارێکی تێچوو ، کە ئەمە ڕەنگە بچووکترین چاپخانەی دەولەت بێ . ئەگەر دوور نەڕۆین و تەنیا لەگەڵ چاپخانەی زانستکەی سلێمانی‌دا بەراوردی بکەین ، ئەوە دەردەکەوێ کە قسەکانی د. نەبەز هیچیان بەسەر هیچەوە نی‌یە ، چونکە ئەوەی سلێمانی نزیکەی نیو ملیۆن دیناری تێچووە . لە ڕووی کارکردنیشەوە ئەوەی کۆڕ بە دەیان بەرهەمی کەم هاوتای پێ چاپکراوە ، بەڵام ئەوەی زانستکە چەند شتێکی کەم .

لە هەمان باسدا کاتێ د. نەبەز وا ڕادەگەیەنێ کە گوایا کۆڕ فەرمانبەرو کاربەدەستی زۆری هەیەو لەگەڵ ئەوەشدا سوودێکی ئەوتۆیان لێ نابینرێ، ئەوە لەمەشدا تەواو بەپێچەوانەوەیە ... وەك ئاشکرایە ، تێکڕای فەرمانبەران و کاربەدەستانی کۆڕ ناگەنە (٢٠) کەسێك ، کەچی لە دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی پتر لە (١٢٠) فەرمانبەرو کاربەدەست هەیە . تەنیا کتێبخانە بچکۆلەکەیان هێندەی هەموو کۆڕ فەرمانبەرو کاربەدەستی تێدایە ، ڕۆژنامەی « هاوکاری » کە هەفتەی جارێك دەردەچێت پتر لە (٣٠) کەسی لێ‌یە ... ئنجا بەراوردی ئیشی زۆرو ماندووبوون و بەرهەمی پوخت و فرەی کۆڕو کەمی مووچەو . . ی فەرمانبەرانی ناکەم ... بەڵام ئەوەندە دەڵێم کە لە هەموو شوێن هەر باسی دلسۆزی و لەخۆبوردوویی و کارامەیی ئەو چەند کەسە کەمەی کۆڕ بێ ، ئیتر مەگەر هەر د. نەبەزو کەسانی وەك ئەو هێندە بێ‌بەروا بن لە شێواندنی ئەو واقیعە ڕوون و ئاشکرایەدا .

بەڵێ کتێبخانەی کۆڕ کتێبخانەیەکی بێ‌وێنەیە ، بەڵام ئەمەش هەر بوختانە کە بووترێ سوودێکی ئەوتوێ لێ نابینرێ .

دوای ئەو هەموو چەندو چوونەی د. نەبەز لە سەرەتای باسی « زاراوەکانی کۆڕ » دا کردوویەتی و ، بەر لەوەی بێتە سەر لێکۆڵینەوە لە زاراوەکان ، ئەم چەند دێڕەی نووسیوە : « هەرچەندە ئەم وتارە جێی ئەوە نی‌یە کە زاراوەکانی کۆڕ لە سەرەوە تا خوارەوە لە بێژنگ بدەم . چونکە ئەمەم هەڵگرتووە بۆ کاتێکی‌دی و شوێنێکی‌دی . بەڵام ئەوا لە گۆڤاری کۆڕ ( نمرە یەك ـ نمرە شەش ) ەوە ، ژمارەیەك لەو زاراوانە وەردەگرم و دەیانخەمە بەردەست هەموو زانایەکی دلسۆزی گەل تا بزانن ئەوانەی ئەم زاراوانەیان بۆ کۆڕ دروستکردووەو بەسەر زانستدا سەپاندوویانن ، بە کەڵکی ئەم کارە نەهاتوون . هەموو مرۆڤێکی بەئینسافیش مافی ئەوەی هەیە حسێبێك لەگەڵ ئەوانەدا بکا کە فەرمانی خۆیان بە ڕاستی و دروستی بەجێ‌ناگەیەنن » ( ل ٩٦ ) . جارێ بوختانە زەقەکەی ئەو چەند دێڕە دەردوێنمەوەو ئەوجا ڕووناکی دەخەمە سەر لایەنەکانی‌تری ... د. نەبەز وای داوەتە قەڵەم کە کۆڕ ئەو زاراوانەی داناوە ، بەسەر زانستدا سەپاندوویەتی . جا تەنیا تەماشاکردنێکی ئەو پێشەکی‌یانەی بۆ لیستەی جیاوازی زاراوەکان نووسراون ، بوختانی د. نەبەز زەرد هەڵدەگەڕێنێ . بە وێنە لە لاپەڕە ( ٢٢٤ ـ ٢٢٣ ) ی ژمارەی یەکەمی بەرگی یەکەمی گۆڤاری کۆڕدا نووسراوە : « بە بۆنەی بلاوکردنەوەی بەشی یەکەمی زاراوی ( کارگێڕی ) لە گۆڤارەکەماندا زۆر بەگەرمی داوا لە مامۆستا کوردە دلسۆزەکان دەکەین بە وردی سەرنجیان بدەنێ و لێیان بکۆڵنەوەو بیری خۆیانمان لە ماوەی شەش مانگدا پێ ڕابگەیێنن بۆ ئەوەی ئەنجومەنی کۆڕ بتوانێت بە شێوەیەکی باشتر دوا بڕیاری خۆی لەبارەیانەوە بدات و بە یەکجاری چەسپیان بکات و بۆ دواجار بلاویان بکاتەوە .هیچ دووریش نی‌یە گەلێك زاراو هەبن کە ئێمە هەستمان پێ نەکردبێ و لە هەندێك لەم زاراوە پێشنیار کراوانە باشتر بن ، لەبەرئەوە تکا لە هەموو برایەکی کوردی خوێندەوار دەکەین ، بەتایبەتی ئەو مامۆستایانەی لە ناوجەرگەی لادێکاندا کار دەکەن ، دەستی یارمەتیمان بۆ درێژ بکەن و هەر پێشنیارێکیان هەیە بە زووترین کات پێشکەشمانی بکەن » ... لە لاپەرە (١٧٠)ی ژمارەی دووەمی بەرگی دووەمدا وتراوە : « ئەم زاراوانە پێشنیارن و بۆیەکا تکا لە هەموو مامۆستا کوردە دلسۆزەکان دەکەین ، کە هەر وەك لیستەی یەکەم و دووەمی بەوردی سەرنجیان بدەنێ و لێیان بکۆڵنەوەو بیری خۆیانمان پێ ڕابگەیەنن ».. دەرکەوت کە کۆڕ ئەو زاراوانەی پێشنیار کردووە ، نەك سەپاندوویەتی .

شایانی باسە ، بەگوێرەی ئەو داوایەی کۆڕ ، ژمارەیەك مامۆستای کوردی دلسۆز ڕای خۆیان بە وتار یاخود بە نامە دەربڕیوە . کۆڕیش بەوپەڕی ڕێزەوە تەماشای بیرو ڕایانی کردووەو بەڵگەش ئەوەیە کە لە چەند ژمارەیەکی گۆڤارەکاندا باسی

ئەوە کراوەو ئەو پێشنیارانەی بە ڕاست زانراون ، وەرگیراون ... ئایا د. نەبەز لەو خزمەتەدا وەك مامۆستایانی دی هاریکاری کۆڕی کردووە ؟ ئەرێ هیچ تێبنیو سەرنجێکی دەربارەی ئەو زاراوانەی کۆڕ نیشانداوەو بە گوێی نەکرێ ؟ ... ئەمانەو چەندین پرسیاری دی لەو جۆرە وەلامیان (نەخێر)ە. جا ئەو زاراوانە کە کۆڕ نەیسەپاندوون و پێشنیارن ، ئەگەر خراپ بن و کورد وەریان بگرێ ، ئەوە نادلسۆزی د. نەبەزیش بەشداری ئەو خراپەکاری یە دەبێ ، چونکە وەك شارەزایەکی زاراوە دەبوو لەگەل بلاوبوونەوەی هەر لیستەیەکدا بیروڕای خۆی دەربڕێ . جا کە د. نەبەز دەلێ : « جگەرم بۆ حالی زمانو کولتوری گەلەکەمان ژان دەکا » ( ل ٨٥ ) ، ئەوە دیارە هەر قسەی ڕووتەو بە کردار نی یە .

د. نەبەز سەرەڕای ئەو بوختانو هاریکاری نەکردنە،هێشتا خۆی بە مرۆڤێکی بەئینساف دادەنێو دەیەوێ حساب لەگەل کۆڕدا بکاو دەلێ : « هەموو مرۆڤێکی بەئینسافیش مافی ئەوەی هەیە حسێبێك لەگەل ئەوانەدا بکا کە فەرمانی خۆیان بە ڕاستیو دروستی بەجێناگەیەنن » ( ل ٩٦ ) . چەند نارەوایە یەکێك ئەو هەموو بوختانو ناڕاستی یە لە وتارێکدا تۆمار بکاو هێندە ڕێزی زانایانو ڕووناکبیرانی کورد نەگرێو بە جوێنو قسەی سووك بەرەنگاریان بێو خۆی لە هەموو کەس بە چاکتر بزانێ و ... ئنجا بە ناوی ئینسافەوە حیساب لەگەل ئەوانەدا بکا کە مەردانە فەرمانی خۆیان بە زیادەوە بەجێ هێناوە .

د. نەبەز بەوەشەوە نەوەستاوەو دەلێ : « ئەوانەی لە دانانی زاراوەکانی کۆڕدا بەشداری یان کردووە بە کەلکی ئەم کارە نەهاتوون » ( ٩٦ ) ... مرۆڤ کە هێندە لە ڕاستیو ئینساف دوورکەوتەوە ، ئیتر چاوەڕوانی ڕوونبینی لێ ناکرێ .

بەئاشکرا دەردەکەوێ کە د. نەبەز لە نزمایی یەوە دەڕوانێتە کۆڕو لەبەرئەوە لە جەوهەری ڕەخنەگرتن زۆر دوورکەوتۆتەوە . بەداخەوە لەبرێتی ئەوەی موناقەشەی زانستی لەگەل بکەم یاخود خەریکی بەجێهێنانی فەرمانی پێویستتر بم کەوتوومەتە ڕەواندنەوەی ئەو تارمایی یەی بە بوختانو قسەی نازانستیانە لە دەوری کۆڕ سازی کردووە .

بەدوا هەموو ئەمانەدا گوایا دەستی بە ڕەخنەی زانستی کردووە ، هەندێ بیرو ڕای نالەباری دەربارەی زاراوەکانی کۆڕ نیشانداوە.زوربەی ئەو ڕەخنانەشی هیچی بەسەر هیچەوە نی یەو خەلك بە سەهوو بردنێکی ئانقەستە بۆ ئاکە مەبەستی دژایەتی ... با بزانین کۆڕ چی نووسیووەو د. نەبەز چی وتووە :

– ماوێتی –

**( پەراوێزەکان ) :**

(٥٧) بێ گومان ، ئەمە ئەو جۆرە دەستنووسانە ناگرێتەوە کە ماوەیەکی ئێجگار زۆر لەمەوبەر نووسراونو دوایی لەچاپدراون .
(٥٨) بڕوانە : لیستەی سێیەمی زاراوەکانی کۆڕ ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەشی دوودم ، بەرگی دووەم ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ١٦٧
(٥٩) بڕوانە : جەمال نەبەز ، زاراوەکانی لیژنەی ریاضیات لەژێر وردەبینی لێکۆلینەوەدا ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، سالی ١٩٦٠ ، ژ ٦ ، ل ١٠٢ – ١٠٩ ، ژ ٧ ، ل ١١٢ – ١٢١ ، ژ ٨ ، ل ٨٥ – ٩١ .
(٦٠) بڕوانە : گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، سالی ١٩٦٠ ، ژ ٥ ، ل ٥٩ – ٦٦ ، ژ ٦ ، ل ٧٩ – ١٠٠ .
(٦١) جەمال نەبەز ، سەرەتای میکانیكو خۆمالەکانی ماددە ، بەغدا ، ١٩٦٠ ، ل ٧ .
(٦٢) هەمان سەرچاوە ، ل ٨ .
(٦٣) تەوفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٩ .
(٦٤) بۆ وەرگرتنی زانیاری پتر لەبارەی ئەو کارانەوە، بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، لیستەی سێیەمی زاراوەکانی کۆڕ ، ل ١٦٦ – ١٧٠ .
(٦٥) هەرچەندە ئەو بوختانانە لەلایەن کەسانیتریشەوە کراون ، بەلام لەبەرئەوەی بە نووسین نەبوون ، گوێم نەداونەتێ .

# دەبێ ئەم «تەرجیع بەند»ە هی کێ بێت؟؟

محمد علی قەرەداغی

ماوەیەك لەمەوبەر ، وەك بەشێکی کەلەپوری ئەدەبی کوردی ، لە سەر لاپەڕەکانی رۆژنامەی ( هاوکاری ) تەرجیع بەندێکی وەلـــی دێوانەم پێشـــکەشی خوێندەواران کرد . دوا بە دوای ئەوە لەم رۆژانەدا ئەم تەرجیع بەندەم دەست کەوت،وا لێرەدا پێشکەشی دەکەم .

لە پێشدا دەبێ ئەوە بلێم کە ئەم تەرجیع بەندەم بە چاپکراوی نەدیوە ، هەر وەها لە هیچ کەشکۆڵو دەسخەتێکی تریشدا نەمدیوە . ئەو نوسخەیەش کە من دیومە ناوی کەسی بـە ســـەرەوە نیە ، لـــە دەسخەتەکەدا پێش ئەم تەرجیع بەنـــدە پارچەیەك شیعری ( حەمە ئاغای دەربەندفەقەرە ) ، ( طالیعی ) هەیە لە بەر ئەوەی ئـەو پارچـە شیعریش ، من پێ بزانم ، تا ئێستە چاپ نەکراوە لە دوای تەرجیـــع بەندەکەوە بڵاوی دەکـــەمەوە ، بە هیوای ئـــەوەی خوێنەران لە خاوەنی تەرجیع بەندەکە ئاگادارمـــان بکەن ، بە دووریشی نازانم هی ( طالیعی ) بێت ، بەڵام بەلگەیەکی بە هێزم نیە .

ئەمەیش تەرجیع بەندەکە :

چراخم دینت ... ...
نەقشەن نە رووی دڵ ئارەزووی دینت
یەقەی کارخانەی ئوستاد چینت
سیاتەر جە دۆی(٢) قەیس دەردینت
لادەر جە صەفحەی بەیضای جەبینت
فەلەک نەشێونۆ شێوەی شیرینت !

★ ★ ★

نازك صەفا بەخش ڕێزەی رازەکەت
نازك لارو لەنج غەمزەو نازەکەت
نازك ورشەی خۆی گۆنای گوڵڕەنگت
نازك پرشە ی چەرخ دیدەی سیوەنگت
نازك نەکریجەی پای عەرەقچینت
فەلەک نەشێونۆ شێوەی شیرینت !

★ ★ ★

ئەرك نیم‌نیگای گۆشەی چاوەکەت
سەندە بی حەیات دڵ کەواوەکەت
ئەلحەق بینایم ! ئەونەمام نۆ !
نازۆ نیم‌نیگای دیدەی مەست تۆ ،
ئیحیا کەردەوە خەستەی خەمینت
فەلەک نەشێونۆ شێوەی شیرینت !

★ ★ ★

وەختێ وەو مەحفەل گوناى لالەوە
وەو تەرتیب تیپ زەنگی خالەوە
مخرامیاوەو پا منیا وە نەرم
پەیا پەی مەوات وە بانگ بێ شەرم
صۆفیو مەلاو شێخ شەیدای پەی دینت
فەلەک نەشێونۆ شێوەی شیرینت !

★ ★ ★

باقی نازاران سوراحی گەردەن
هەرکەسێ کەسێش سەودایی کەردەن
بەلام ئەی شێوە ، ئەی شیشەی گەردەن
هەزار کەس چون من بەردەن بە مەردەن
سا چون وەی طەورەن طەرزو ئایینت
فەلەک نەشێونۆ شێوەی شیرینت !

★ ★ ★

گوڵ خجڵ جە رووی نازک طەرز تۆن
عەرعەر حەلقەگۆش بالای بەرز تۆن
ئاهوو شەرمەندەی دیدەی مەست تۆن
چون من دلداران دڵ پابەست تۆن
پێچدەر وە ماران زولف چینچینت
فەلەک نەشێونۆ شێوەی شیرینت !

★ ★ ★

ناز بێ ئەنداز بالای شەنگ تۆ
مەزەی رێزەی راز غونچەی تەنگ تۆ
نازکی لالەی گۆنای ئەحمەری
جینو ئینسو طەیر فریشتەو پەری
کەردەن وە هامدەرد قەیس خەمگینت
فەلەک نەشێونۆ شێوەی شیرینت

★ ★ ★

نازیزم ! تانەی گرۆی بێ دەردان
نایرێ نە تۆی دەروونم وەردان !
من ئاسا بەلکم شەیدابان پەرێت
بنمانە پێشان بەدر جەبهەی وێت
بەلا پەشێو بۆ زولف موشکینت
فەلەک نەشێونۆ شێوەی شیرینت

★ ★ ★

یەک رۆ جە ناکاو جە صوبسەحەردا
پەنجەرەی هەیوان مەشریقی هۆردا
هەوادا پەردەی رووی صەفحەی جەبین
خێزا واوەیلای گرۆی موئنیبین
ماشەللا جە شەوق بەیضای جەبینت
فەلەک نەشێونۆ شێوەی شیرینت !

ئەمەیش پارچە شیعرەکەی ( طالیمی ) = حەمە ئاغای دەربەندفەقەرە :

دڵ بێ تۆ ، تۆتۆ ... ...
دیدەم ! بینایم ! دڵ بێ تۆ ، تۆتۆ
ئاهـ ئاهیرناک سۆز پڕ ئەندۆ
چون کەباب نار دۆزەخ مەدۆ بۆ
وە فیدای فەرقت بام ، ئەبرۆ ماهـ نۆ
جارێ نە رای حەف بواچە : بۆ بۆ ؟
ئەگەر خەوفت هەن نە حەرف بەد گۆ
وە تای بێ هەمتا تەوەکولت بۆ
هۆناو جە دیدەم جۆ بەستەن جۆجۆ
یە گشت نە هیجران دیدەی سیای تۆ
کۆت رسواییت پۆستەم بەستەن نۆ
دیدەم وە دیدەت رۆشنیش مبۆ
چێش مبۆ دیدەم ! نە یەک ساڵ ، یەک رۆ
بنمانی بالات چون هیلال نۆ
مکێلام دۆێ نە هەردان کۆ کۆ
خەرمانێ لە خاک گردبی وە کۆ
مکەرد وە سەردا موات : هەی رۆ
یە گرد لە دووری بالا ( نمام ! ) نۆ
وەرنە ( طالیمی ) زام ئەبرۆ نۆ
فەرز کەردەن بەویش وە مەحشەر بەرۆ

## پەراوێز

(١) بڕوانە : محەمەد عەلی قەرەداغی ، تەرجیع بەندێکی وەلی دێوانە ، هاوکاری ، ژمارە . ٣٩١ ، ٢٦ تشرینی یەکەم . ١٩٧٨ .

(٢) ئەوەی بە ( دۆی) واتە : دووکەڵی .. نووسیم هەڵیش ئەگرێت (رووی) واتە : دەمو چاوی .. بێت .

# سەیدایێ طاهر رشدی و دەستویرخازی یا دوماهیێ



**صادق بهاء الدين ئاميدي**

سەیدایێ هێژا ئاخفتنخوش ، ترانەکەر ، زانا ، ژ خودێ ترسی ب زاخ و زەفر ، بەرێ سپێدەیا رۆژا ئینی چاردەی (١٤) ێ تیرمەهێ (١٩٧٨) ێ ل دوی رابوینا خو یاکو بەرێ سپێدەیان رادبو ، رابو . وەکی هەمی رۆژێت دی دەستنڤێژا خو شویشت ، دەست ب قورئان خویندنێ کربو دخویند ، ل ژڤانا بانگێ سپێدێ بو کو بێتە دان دا نڤێژا سپێدی بکەت وەکی هەر رۆژ و د ناڤ جهێ خو د رازێتەڤە هەتا کو دبیتە دەمێ سەرتێشتێ . بەلێ یا ئەو هزرا ئەو پێ ژ خەورابوی نەدجهێ خودا بویە ، ژبەرکو رۆژا وی هاتبو هەر وەکی دبێژن ، ویچو بەهرە و پشك دڤێ دنیایا ژبو کەسێ نەمایە ونامینیت نەمابو . دەم و گاڤێت وی ب دویماهی هاتبون چو وێ ودسا ژی نەمابو ، دلێ وی یێ پێتر ژ شێست سالان ، دخوشی ، نەخوشی سختنی و ، تەنگاڤی و ئالوزیادا وەکی پویلایی کارێ خو دکر ب درستی ، ژ کار کەڤت چاڤ لێ کەڤتنە سەرێك بەری بانکی سپێدێ ب گافەکێ ، قورئان د کوشییدا ما ڤەکری هەر وەسا ژی چاڤك د چاڤاندا مان ، دەستویری‌یا دویماهیێ ژ کورو نەڤیا ژ خزم و کەس و کارا ، ژهەڤال و هەڤکورا خاست چو بەر دلوڤانیا خودێ ، وەکی هەمی زێندیان یێت دێ د وێ رێکێرا دچن و د گەهنە وێ قوناغێ چ ژار و رێنجبەر بن یان دەستهاتی و خوندکار بن .

سەیدایێ نەمر مروڤەکێ بێ زیان ، ڤەدمر ، کێم ئاخفتن‌و و ترانەکەربو . ژ نیاسێت من بو ، ژبەرکو ئەم خەلکێ جهەکی بوین ، ئەگەرچی ژ من مەزنتربو بەلێ چەند مە ئێك و دو دیتبا دادگەلێك سوحبەتێ هەرشینین و گەلەك جارا ژی کەڤینە گێنگەشێ . بەری هەڤت سالا من ژێ خاست چەند هوزانێت خو دگەل ژینەنیگارا خو بو من بنڤیست داکو بەرهەڤ بیت دکتێبا پاشەرۆژەکا نێزیك ب ناڤێ هوزانڤانێت بەهدینادا بێتە بەلاڤکرن . بەلێ بەرسڤا وی ل سەر دارخازا من ئەڤەبو کو دیوانا وی یاکو من بەرهەڤکری بوچاپکرنێ د بار و زرڤێت ئالوزیایی یێت ئامێدیێ نەمازە ل سالا (١٩٤٥)ێ چو د دەرزەکا دیواری‌را و هاتە سوتن . بەلێ پاشی من کوتنەکی لێ کری کو چەند نمونێت د هزرا وی‌دا ماین بو من بنڤیسیت پاشی هەیامەکێ خوشی بەهەشتی ژینەنیگارا خو دگەل (١٢) هەلبەستا و وێنەکێ خو پێشکێش من کرن من سوپاس گوزاریا وی کر و دکەم . دەقا ژینەنیگارا وی ئەڤەیە :

**بەهەشتی ناڤ محمد طاهر کورێ روشدی ئەفندی کورێ مەلا طاهری کورێ مفتی مەلا عوبەیدێ ئامێدی‌یە . ل بهارا سالا (١٩١٢)ێ ل دوی گوتنا خالێ رەشید ژ دایی بوی مە ل ئامێدیێ . ل رۆژا ( ١٤-٧-١٩٧٨ ) ێ دونیا روهن لێ تاری بویە چویە بەر دلوڤانیا خودێ .**

سەیدایێ نەمر ل دوی دویروکا ژدایێ بوینێ و چاڤ لێ نڤیانێ (٦٦) سالان چی‌یە . ژ بنە مالا مفتیێ ئامێدیێ‌یە کو مالەکا زانا و روشەنبیر بویە ، هەر ژ بچویکنی ل نك بابێ خو روشدی ئەفەندی قورئان خویندی‌یە . پاشی عەقیدا ئەحمەدێ خانی ، پاشی نوبهارا خانی کو فەرهەنگەکا ژرێڤە یا کوردی‌یە . پاشی گولستانا سەعدی ، پاشی بهارستانا جامی ب فارسی . پاشی کتێبا « العوامل » نەحوێ یەکێ خویندن دگەل کتێب و تەرجومێت زمانێ عەرەبی

وەکی ( سیوطی ، و تەرجمە « الفیة ابن مالك » .
ناڤبری ێێ ئەمر ل خویندنگەها سەرتا ئامێدێی خویندیە هەتا سالا (١٩٣٠) ێ هەتا دویماهی پێ ئینایە ، چۆیە خویندنگەها دەرسداران «دار المعلمین» ل بەغدایێ . سێ سالا ل وێرێ ژی خویندیە و خویندناما وێ وەرگرتیە . ل پاییزا سالا (١٩٣٣)ێ ژ رۆژا ( ١-١٠-١٩٣٣ ) ێ هەتا ٣١-٣-١٩٥٨ ێ دەرسدار بویە د خویندنگەهێت سەرتایی‌دا . کو ژرێڤە ل زاویتە دەرسی گۆلینە پاشی ل ئامێدێی ددرسدار دە بویە د خویندنگەهێت سەرتایی‌دا . و خویندنگەهێت دی ل دڤەرا بەهدینا .

سەیدایێ ئەمر طاهرێ روشدی د زمانێ عەربیدا شەهرەزا بویە دەستەکێ بلند وبالا د زمانێ ماکێ و ڤەهاندنا هۆزاناداا هەبویە کەسێ یەکێ بویە هۆزان د کۆڤارا ( گەلاوێژ ) دا ب ناڤێ « لاوێ بادینی » بەلاڤکرین ، ژ بلی گۆتارێت ل سەر هندە هۆزانڤانێت دڤەرا بەهدینا وەکی بەکر بەگێ ئەرزی ، ێێ کو کورتەك ژ ژینەنیگارا وی و هۆزانا ب نائلەخانا کابانیا میرێ ئامێدیێ سمایل پاشایی هلدایی ئانکو گۆتی کو د بەرپەرێ ( ١٨ - ٢١ ) (١) ب ڤێ ناڤ و نیشانێ : بەکر بەگێ ئەرزی بەلاڤ بویە .

سەیدایێ ئەمر دیارە کو ئەڤیندارەکێ دلسۆزێ زمان و روشەنبیریا کوردی بویە،ب گرۆڤێ ڤێ هۆزانی یاکو دلگەشی و شادمانیا خو ب دەرکەڤتنا کۆڤارا ( گەلاوێژا ) (٢) رەنگین سالا ( ١٩٤٠ ) ێ خویا دکەت ب ڤێ ناڤ و نیشانێ :

(١) گەلاوێژ ژمارە (٣) شوبات ١٩٤٠ .
(٢) گەلاوێژ ، کانونی دوهەم ( ١٩٤٠ ) ژمارە (٢) سال (١) .

بو کوڤاری گەلاویژ

**بوت ئەنوسم ئەی برای خوشە ویستم**
**کە کوڤاری گەلاویژ هاتە دەستم**
**ئەوندە دلگەشم سەرخوشی و مەستم**
**خویندمەوە گوتە گوتە بێ مژویل بوم**
**شەویك تا روژ ژ کەیفا خو نەنوستم**
**دلی گەمم بە ئاواز کەوت ستران گوت**
**کە نوسینی گەلاویژی لەناو خودا ئەیخستم**
**دەلم گۆتی بەلێ ئەز ژی هەڤال بوم**
**لەوانی ئەز ژ ڤەگیرانی ئاوەستم**
**گوهم گۆتی برام هونور بو من بی**
**کە من گوتەی ئەوی بەجی گوهاستم**
**ئەزمانم گوت بژین ئەیوە هەموتان**
**منیش یارم دگەل ئەیوە درستم**
**گیانم گوت ژیانم گوری ئەیوە**
**ژیانم هەر ئەومزەبان پەردەستم(٣)**

دیسا هۆزانەکا دی یا بەهەشتی د هژمارا (٥) و (٦) ێ نیسان و مایس ( گولان ) سالا ( ١٩٤٠ ) ێ ل بن ڤی ناڤی : « گۆرانی » بەلاڤ بویە (٤) .

لاوی بادینی

**لیڤ وەچکی مێژمێژوکا سور یارا من**
**بەری سەرەوە و گولالە دویلك ریچۆلە کەبەدۆبە**
**بو لێڤا هەمو عشق و ئەڤینا من**
**تەوافا لێڤا لاو حەجمتینە وەی داخاز ئەیویە**
**ج خۆشە لێڤ ل سەر لێڤێ خومارا من**
**دلێ خۆشە گیان ب کەیفە سەیرانا ژیینی هەر هوبە**
**یارە ب تنێ دبیتە رەوشەوارا من**
**روی چون گولە ، چاڤ سنبلە دەلال و دلبەرا خوبە**
**ڤیانە کاکلا ڤیێ ژیینا من**
**مەژی تیژم ئەزمان تیلم جەگەر گەرمم وەکو سوبە**
**بو سەربەستی و ڤرازیە دنیاداریا من**
**کو سەربەستبوم و ئازابوم ژیینا من پێش تاسکوبە**

(٣) دەقا ڤێ هۆزانێ ب گوهورین هاتە ڤەگوهازتن .
(٤) گەلاوێژ نیسان و مایس ژمارە (٥) و (٦) سالی (١) بەرپەرێ ( ١٣ - ١٤ ) .

تشتێ پێ تڤی گۆتن ئەڤەیە دەنگی « ڤ » د کۆڤارا ناڤبری‌دا کریە ( و ) . ژ بلی وان ژی ئەڤ هوزانا ژێری‌یە د کوڤارا « گەلاوێژ » دا هاتیە بەلاڤکرن کو ژ هۆزانێت وی یێت ئێکجار شەنگ ێر رەنگ و ڤەشەنگە ئەڤە چەند مالك ژێ بۆ نمونە :

**سورگولێ تەر ژ خوناڤێ**
**لێڤ کولیلکا بێن گولاڤێ**
**روی چۆ هەیڤا پڕ سیتاڤێ**
**کوشتم تە ب داخا ئەڤینێ**
**کوشتم تە ب داخا دو چاڤا**
**تیر کو بەردابو هناڤا**
**ئەشیام ئەز پاڤێم دو گاڤا**

ژ کویـــری و ســاریـا برینـی
ل مـن برین پـر خـوین و زوختین
هەر ب فویریایی و کەل تین
ئاخ و نالین دگەل ڤیتهەل تین
سەد قەدا بن ل سەر ڤی ژینێ
سەد قەدا ب جانێ م کەفتن
ئیش و دەرد ل من سەد حەفتن
هند کەتن هندەك ژی جوفتن
حالێ من وەك مەم و زینێ .

وە نەبیت بەهەشتی هەر ئەڤ هوزانێت د گوڤارا (گەلاڤێژ) ێدا بەلاڤکرین ب تنێ ڤەهاندین، بەلێ ل دوی گۆتنا وی هەر وەکی هاتیە دەست نیشانکرن دیوانەکا درست هەبویە بار و کریارێت ئالۆز نەهێلا ، ژ دانزدە هەلبەست بژارە دەفتەرەکێدا مایینە بۆ من ل بەرنڤیسینە هەر وەکی هاتیە روهنکرن . ژ هەلبەستێت وی یێت د گەلاڤێژێدا و یێت بو من د دەفتەرەکا خومالیدا نڤیسین دیار و خویا دبیت کو نەمرێ ناڤبری هۆزانڤانەکێ دەست هەل و ژبەر خو دەرکەڤتی بویە د ڤەهاندن کێش و سەنگاندنێ ، دبن بارو زورێت سیاسی ل دەڤەرا بەهدینا وی چاخ و دەمی کو رێ نەدایە ب چو جۆر و ئاوایا بیر و باوەرێت خو ب سەربەستی دەربیریت ، نەکو تەنگاڤیەك بەرهنگار بیت نەشێت بەرەڤانیا خو ژی بکەت(٥) . ژبەر هندێ کێم هۆزان ب وەلاتپارێزێ ڤەهاندینە ئەو چەندەکێت ڤەهاندین ژی وەنەبیت بەر روی بن . بەلێ ب نیشانکرن ئانکو رەمزیێنە و ژ هۆزانێت وی یێت ژار و لاوازن وەکی ڤێ یا سالا ( ١٩٣٤ )ێ ڤەهاندی ئەڤە چەند مالك ژێ بۆ نمونە :

**ئەی کوردێ ئەڤرۆ هەر بڕژی**
**تو زێدەکە هزرێ و مەژی**
**داخو خلاسکەی ژ پیسی**
**چ ب چەپچەرینکی و چ ب هەژی**
**تو پاشڤە مایی ژبە وەحشەتی**
**ئەو تەشقەلە تەبون تژی**
**دڤێتن خو تالیکەی ب برا**
**ئاڤا ژینێ ل خو بڕژی**

(٥) د هندە دەماندا ئالۆزی گەهشتبو رادەیەکا وەسا خو کوڤارا گەلاڤێژێ یاکو ل بەغدا چاپ دبو دەدەستێ ئێکیدا دیتبا دا پێ هێنە گونەهکارکرن و گرتن و ب سەد کوتەکا ژێ ئان دا بەردەن

یان ژی دا د زیندانێدا مینت هەیامەکێ خۆشی .

بە هشتی چونکی هزرا وەلاتپارێزێ جهێ خو د مەژی و مەژکوتکێ ویدا کربو و رێ نەددیت وان بیر و رایان دەربیریت ، ژ بەر هندێ ب ئاواتێ ئەموژکاری و شیرەتان ئەو بیر و باوەر ل بەر چاڤان دانانە هەر وەکی دڤێ هۆزانێدا دبێژیت :

**رێکا راستا سەرفەرازە**
**نەکو رێکا خار و ڤ پێچ**
**بندەڤا باتسا بهایە**
**نەکەتیت کو ب نیڤی پویچ**
**ئەو کەسێ گویز ا بگریتن**
**ژێ دگریتن کەتا ڤویچ**
**بەسە ڤی جارێ بێژیتن**
**پرهەڤی و حەجیلوك و عویچ**
**مە چ قازانجکر ژ ڤانا**
**بژلی هزر و بیرا هیچ**

پاشی دبێژیت :

**دێ بهێلن خاف و خرچی**
**ئەی گەلی لاوێت خوجیچ**

بەهەشتی ئەگەرا پاشکەفتنێ دایە بال نەزانین و نەخوێندەوارێ هەر وەکی دڤێ هۆزانا ب نەزانینێ ڤەهاندی دبێژیت :

**نەزانین دەردە و هەچی نفێ نەساخبیت پێ**
**جهێ خو دێ کەتە تەشمە و دێ خو هێلتە بێ دەرێ**
**هەتا عەردێ وی گەر زێر بیت تژی و پڕ کان**
**دێ بینە ریخ و شیلا کو تژی خەمخور و پڕ پرێ .**

سەیدای نەمر پێشکەفتن ب بزاف و خەباتێ ڤە بەندکریە و گرێدایە هەر وەکی ژ هۆزانا ژێری دیار و خویا دبیت :

**ئەی برا خو نەی ڤروتی یان شلی**
**ساخلەمی و بێ تێکەهشتی و چاف زلی**
**پێ بێ تەین بۆچی دێ کەفیە سەر تلی**
**خو نەماری دی هەلشکێڤی گلی**
**وەی خوزی تو کورەماریای ب غولغولی**
**تێکڤە دەی دەشت و زوزانا ب زنزلی**
**بۆچ پوڤدای وەی وەرمتی و ڤلی**
**تاخڤی خەلکی ب رەڤی و زشتی و سلی**
**دێ پەحن بی تو ل بن پشتێ چولی**
**دێ نڤی کو ب وەرمی ل بن کەرجلی**

**پاشی دێ هەر چ رەخێ ستویێ تە ژ ملی**
**تشتەکێ پویچ دێ بخازی و ب چلی**
**هەرمی تاکەی دی مینیە هلهلی**
**ما ب چلاتیێ دێ رەحمەت بیت دل کولی ؟ !**

بەهەشتی دەستەکی چاك د بێ گوتنێدا هەبویە هەر وەکی دڤێ هۆزانا وی یاکو ب خویندنگەها مەزن یا ( قویا ) ڤەهاندی دیارە :

**چ تشتەکێ عەجیبە**
**ئاڤاهیێ ڤێ مەدرەسێ**
**هوستایەکێ لەبیبە**
**خودانێ ڤێ هەندەسێ**
**خوندکارەکێ مەهێبە**
**مەزن ژێ نەکە پرسێ**
**نەڤانا وەك خو نینن**
**ب جوملە کو بوینە سێ**
**وەرن ئاڤاهی بینن**
**دا بزانن راستیا ڤەمێ .**

سەیدایێ نەمر بێ کو گەلەك تەنگاڤی ، سختی و ئالۆزی ب سەرهاتین ، گازندا ژ ژین و ژیارا پـر ئێش و ژان کول و کوڤان دکەت بەلێ دیسا خو بێ هومێد ناکەت کو خو ب دەستڤە بەردت بێژیت بەرەڤانی ژ من ناهێت ، بەروڤاژی وی دەست و دایە ب درستی و ب لڤین و بزاڤ و خەباتێ و زەند هەلکرن و دەستە تڤ دانە خو ئەو دەست و دا دێ هێتە گورین هەر چەند سنگ داریتی و پویلا ژی بیت دبێژیت :

**چ بوتە بێژم**
**چ بو خو بێژم**
**ئەز هەرێ گێژم**
**روندکێت چاڤێت خو چو جار نارێژم**
**ب بیناهیا چاڤا نانی خو دپێژم**
**ئاڤوکا ژینێ ب هێزێ دمێژم**
**هندی تە دڤێتن ئەز یێ درێژم**
**هندی مەزن بم بزانە هەر تێژم**
**سیبەر من ناڤیت دێ چم بەر تاڤێ**
**گاڤی بو گاڤێ**
**دێ چم بەروانە گەهمە بەر ئاڤێ**
**لاڤا ژیارێ دۆژە من ناڤێ**
**شەپەر من بێ تەین ناکەڤم داڤێ**

**دێ ڤرمە باغی ل نك بەلەك چاڤێ**
**دا سەر خۆش ببم ژ بێهنا گولاڤێ .**

سەیدایێ نەمر ترانەکەر و حەنەکزەن بویە بو سوحبەت و حەنەکا نەمازە دگەل مرۆڤ و کەس و کار و هەڤالا هۆزان ل دوی هۆزانێ ڤەهاندیە داکو ژ کەنیادا زکی لێ بێشینت ، هەر وەکی ژ ڤێ هۆزانا ب ژرمامەکا خو هلدایی دبێژیت :

**گولەندام خۆش ڤن مامە**
**ئەسلێ شۆلا زانینە**
**هەر چەند ژنەکا بێ ڤامە**
**مالدارە و ڤویت جەمینە**
**تەشریفکرە مالا مە**
**هنێری وەی ببینە**
**هات دیت تێشتا مە سالار**
**مێروك هنارتە ماستی**
**گوتێ لەزکە بکە ڤار**
**دا بخوت تیشێ ب راستی**
**طاهر هێدی بخو سەربار**
**من ماستێ بوتە خاستی**
**چاڤێ من ما ل مێروکێ**
**و چاڤێ دی بێ ل ساڤارێ**
**داکو بینیت سێنیکێ**
**دا تێر بخوم کرارێ**
**هەتا هات بن حولیکێ**
**پاریێ ب ترسی چۆ خارێ**

بێ گومان بەهەشتی طاهر روشدی ژ شاگردێت خویندنگەها ژرێڤەیە یا ڤەهاندنا هۆزانیێە کو خویندنگەها مەلایێ جزیری‌یە ل دوی بیر و باوەرێت کورد و بیانیان ژبەرکو د کێش و سەنگ و لێك ئینانێ ل سەر وێ ریچێ چۆیە ، هەروەکی دڤان نمونێت ژێری یێت دیوانا وی ئەو راستی دیار خویا دبیت :

**١ ـ من دی دخەوێدا دولبەرەك**
**روی بەفر و خوینا بسك بەلەم**





(١) ژ بو مروڤێ فەلیتە تێدەکوتن .

**دو لێڤ چولال بـون چاڤ بەلـەك**
**( فكانهـا البـدر بـدا )**
**ب جانیـا خـو وەك یوسـفی**
**رۆژ سپێدێ ژبـەر وێ خـەسفی**
**كێشابـو سـەر چاڤا كـەمفی**
**( من تحت زولفیهـا النـدی )**

**سـور گولێ تـەر ژ خونافـێ**
**لێف كولیلكـا بێن كـولافـێ**
**روی چـو هـەیفا پور سیتافێ**
**كوشتم تـە ب داخـا ئەفینێ**

ژ نمایشت و راڤا ژۆری یاکو مە چەند نمونە ژ هوزانێت ناڤبری پێشکێشکرین دیار و خویا دبیت کو بەهەشتی هوزانڤانەکێ دەستهاتی بویە د ڤەهاندنا هوزانێ نەمازە ب ئەڤینی ودلاتبارێزی ، پێ‌گوتـن ( وەسف ) ، ترانە و حەنەکزەنیێ و پەروەردەیێ ل سەر رێچا هوزانڤانێت کلاسیکی چۆیە ، نەمـازە مەلایێ جزیری یێ سەرهوستا .

بەلێ بەهـەشتی وەنەبیت هەر هزرا تۆرێ د مەژی مەژکوتکیدا جهگیر بیت ، بەلێ زمانێ ماکێ یێ ل سەر زمانی خۆشی و شرین ژی جهێ پویتە پێ کرن و خەم خارنا وی بویە ب گرۆڤێ بزاڤکرنێ کو فەرهەنگەکێ بەر هەڤ بکەت بۆ بەلاڤکرنێ . ئەڤ فەرهەنگە یا بەهەشتی دەست پێکری و دویماهیێ پێ ئەئینـای ب ناڤێ فەرهـەنگوکا کـوردی و عەرەبی‌فەبر « مختصر قاموس كوردی عربـی » ب ناڤ کربو و ناڤێ خو : محمد طاهر رشدی آل مفتی العمادیە سالا ( ١٩٦٠ - ١٩٦٠ )ی . ل بن نڤیسیبو .

سەرێ فەرهەنگوکێ ب پێش گوتنەکا هەفـت رێزی دەست پێ دکەت ئەڤە چەند رێز بو نمونە :

« ب ناڤێ پاکێ بەزدان باخوێ خودان ، پاش سلاڤ ل سەر پێغەمبەرێ مەزن محمدێ عەرەبی من ئاخفتنوکێت کوردی وەرگێرانە عەرەبی ... هتد .

پاشی ل دوی دەنگێت زمانێ کوردی ب رێـز ئانکو فونێتمان فەرهەنگوکا خـو نڤیسی‌یە ب تیپـا ( ئا - a ) دەست پێ‌کریە ب کرتی هەتا کو گەهشتیە تیپا « ك K » چار بەرپەر ژ فونێتما « ك » ژی نڤیسی‌نە . بەلێ پا ڤیایە سەرێ ژ نوی بنڤیسیتەڤە ب گرۆڤی پێش و پاش‌کرنا بێژەیا بەلێ دویماهی پێ نەئینایە ، گەلـەك بێژە دناڤرا نڤیسـی‌نە ، د دەمێ نڤیسینێ هزر نەکرینە .

سەیدایێ نەمر هەر وەکی د وێنێ ژین و ژیارا خودا ژ مرۆڤێت سەربەست و ئازاد پەروەربویە و د هالە چاڤ ، ئەگەرچی خو روی ب روی ب وێ چەندێ دیارنەکریە ، ژبەرکو وارگەهێ لێ کو دەڤەرا بەهدینا بویە بەری شەرێ جهانی یێ یەکێ و شەرێ دووێ جهانی هەتا (١٤)ێ تیرمەها پیرۆز ئێکجار ئالۆز و ب شەڕ و هنگامە و بێ تەنایی بویە ، زۆردار و ستەمکارا ب ئەشکەرایی رەنج و وەستیان و خوهفەمالینا پالە و جوتیار رێنجبەران خواریە ، خو پێ دل خۆشی و بەختیار کریە ، کـو ئەو دەست درێژی بوینە دل و هناڤ ل بەهەشتی کوزراندبنە ئەشیایە چو بەرەڤانیا بکەت و ڤیایە سەربەست و ئازا دگەل گەروانـێ ئازادخواز و سەربەست خوازێت وێ رۆژێ (١٤)ێ تیرمەهێ بێت بەری خو ژی ، گورێ وەلاتی ببیت .

سەد هزار رەحمەت ل سەر گیانێ وی یێ پاك و پێشەمانێ دونیا ستەمکار نەبیت . بەهەشتی بەرێ هزر و مەژێ خو بۆ ملەتێ کورد و مروڤاتیێ هێلا .

سەرهاتیا مەزنانە . « بەفر دچیت چیا دمینت، مرۆڤ دچیت ناڤ دمینیت » .

ناڤێ سەیدایێ نەمر طاهر رشدی دێ هەر و هەر وەکی ستێرەکا گەش د ئەسمانەکێ شینێ ڤالدا یێ پڕ روهن و روناهی و روشەنبیت د ئەسمانێ تۆر ورەشنبیریا کوردی‌دا دێ هەرێ گەشدار بت .

# ڕەنگدانەوەی ـ وێنە ـ لە شیعری نوێی کوردیدا

• محسن ئاوارە •

گومان لەوەدا نیە هەموو شیعرێ خۆی لە خۆیەوە وێنەیێکە یان چەند وێنەیەکی تێکەڵاو بە یەکن ، ئەوەشیان دوای ئەوەی لە ستۆدیوی دڵی شاعیر شۆراوەتەوەو پەڕیوەتەوە سەرکاغەز ئنجا گۆڕانکاریەکانی تری هونەریو جوانکاری بە سەردا تێپەڕیوە .

تاودانی ئەسپی ئەم باسە لە گۆڕەپانی ( ڕەنگدانەوەی ـ وێنە ـ لە شیعری نوێی کوردیدا ) بێشك ڕێگاکەی دەشتێکی بەر فرەوانو تەخت نیە ، بەلکو بەردەلانەو زۆر کەلو بەریتیایە ، و من نامەێ لەم بێشەلانە جەنگەڵو ئالوزدا بەم ئێوارە وەختە بمێنێمەوەو شەوم بەسەر دابێو ئەو ڕێگەیەی پیایدا هاتوومئەوەشم لێ وون بێتو سەر لەخوێنەوارانیش بشوێنم ، بەلکو ئەوەندە دەڵێم لە بواری خزمەتێکی بچوکدا دەمەوێت چەند قسەیێ بکەمو هەندێ نمونەش بهێنمەوە بەو شیعرانەی کە وێنەو دیمەنی بە چاو بیندراو یاخود بە گوێ بیستراو لە ئینجانەکانیاندا بە گوڵی بۆن خۆشو قەشەنگ سەریان هەڵداوە .

وێنە لە لای مرۆڤێکی ئاسایی دەبیندرێ هەستی پێدەکرێ ، بەلام هەژانو گلپەیەکی کاتیبەو دادەمرکێتەوە ، کەچی لە لای شاعیرێ دەبێتە چۆلەکەو بە تۆڕی دڵو مێشکیەوە دەنووسێ ، وەك پەنگری ژێر خۆلەمێشیش بە گەشاوەیی دەمێنێتەوە ، دوای ئەوەی تاقیکردنەوەو ئەزموونو مەناڵەکانی خۆیەکی یان بابەتییان لەگەڵدا ئاشنا دەکا ئینجا بە وێنەیەکی درەوشاوەو لەجولە نەکەوتوو بە بەرگێکی ڕازاوە دەیگەڕێنێتەوە بۆ ناو باوەشی کۆمەلەکەی .

بۆ نمونە : ئەگەر وێنەیەکی خەماویو کاریگەر بە جۆرێ کار لە مرۆڤێکی ئاسایی بکات کەوای لێ بکا دەست بۆ دەستەسرەکەی درێژ کات تا دڵۆپە فرمێسکەکانی پێووشك بکاتەوە .. دەبینین هەمان وێنە لە لای شاعیرێ بە شێوەیەکیتر دەگۆڕێ ، وای لێ دەکات دەست بۆ پارچە کاغەزێ بەرێ تا چاوی پینووسەکەی پێ بسڕێتەوە ، لە جاری یەکەمیاندا پارچە پەڕۆکی تەڕبوو ووشك دەبێتەوە ، لە هی دووەمیاندا کاغەزێ نوسراو دەمێنێتەوە ، بێشك هی دوودمیان شیعرە .

ـ ( بۆدلێر ) ـ شاعیری بەناوبانگی فەرەنسا دەڵێت :

«شیعر بە هونەرەکانی ـ وێنەکێشان ـ چێشت لێنانو چەورایەتییەوە دەلەکێت ، چونکە توانای دەربڕینی ئەم هەموو هۆشانەی تیایە کە هەست بە تالیو شیرینی ، سەرفرازیو پەژارەیی دەکاتو بە ستایش نووسەوە وەدەنووسێت لەم سیفەتە لێکچوانەدا »(١)

چەند جوانە کاتێ شاعیرێکی وەکو مامۆستا ( گۆران ) ی نەمر دەبێتە وێنەکێشێ لە ڕووی ئەو ئێوارە فێنکەو بە کسپەیەی هەموو ڕۆژێ دووبارە دەبێتەوە ، قاچەکانی لە دوا ناین ـونکە وێنەی گۆزە بە شانێ ڕای دەگرێو نازانێ

چۆنی بلوێنی ، ڕێ ... ڕێی کانیەو ڕێی خرپەو مەترسی لاوانە ، هەر بۆ ئێوارەیێ بۆ ئەو شاعیرە چۆڵ نابێت .. هەر هیچ نا بەو گوزە بە شانە بلێت ( یان گوزەکەت دەشکێنم ... یان ماچێکت لێ دەستێنم ) ، وە لە لایەکی تریشەوە لەم دەرگایەوە وەدەرکەوتووە کە قیبلەی ڕووی ئەهلی نیازە .. ئەوەتە وێنە زیندووەکەی بە پێوە وەستاوەو دوگمەکانی بەر بەرۆچکی دەکاتەوەو یاخە زەردەکەی ئێواران دەترازێنێ :

**ئێوارەیە وا ، هەلگرە سا گوزەی تازە**
**ڕێی کانی قوربان منتظری جلوەی نازە**
**بەر دەرگەکەتان قیبلەی ڕووی ئەهلی نیازە**
**ئێوارەیە وا ، هەلگرە سا گوزەی تازە (٢)**

کاتێ وێنەکێشێ فلچەکەی دەخاتە نێو پەنجەکانی بۆ خستنە کاری ئەو عیشقە پیرۆزەی بۆی خولقاوە ، وە بۆ دامرکاندنی ئەو گرە ئارام لێ هەلگیراوەی کە مرۆڤێکی پێ سەرگەردان کردووە با بلێین ئەو مرۆڤە پیکاسۆیە ، بەلام ئەگەر هەمان پیکاسو شیعر بنوسێ ، هەمان کار دەبێنێ ، تەنیا لە شوێنی فلچەو بۆیاخ ، پینووس مەرەکەب بەکار دەهێنێ ، وا.

ـ گارودی ـ لە باسی پیکاسۆدا دەلێت :

« پیکاسۆ مرۆڤەو وێنەکێشە ، واتە مرۆڤێکە بە چاوەکانی دنیا هەلدەکرێنێ ، لە دوایدا بە دەست دایدەڕێژێ ، وە لە نێوان چاوەکانیو دەستیدا سەرو دلی مرۆڤێ هەیە کە کاری نواندنو وەرگێران بە میانیاندا تێدەپەڕێ »(٣)

ـ نێسکەی ئەسپی ڕەسەنو خوورت ، ئەو ئەسپەی دەحیلێنێو هەر دوو دەستەکانی بەرز دەکاتەوەو دایدەگرێ ، سمەکانی لە زەوی دەکوتێ ، سمکۆل دەکاو دەڕوانێتە دەشتێکی سەوزو بەرین ، گوێچکەکانی لێك دەدا ، دیارەددزانێ هەلبەر هەلبەڕو غار غارێنێکی زۆری پێدەکرێ ، چونکە لەم دێیە شاییو زەماوەندە ، شۆڕە سوار ئاشقە ، ئەوینی جوانی لەرەی مەمو سووکە ڕەوتی گوێ بە گواران ، کاتێ وەك سوێسکە هەنگاو دەنێن ، مەگەر ئەم چەپکە نیشکە هەر لە کلاورۆژنەی دلی مام « هێمن »ی شاعیر بە دەرکەوێ لەم چوار دێرە شیعرەدا : ـ

**لە مەیدان دیومە نێسکەی ئەسپی خۆشبەز**
**لەگەل دەستو جلیتی شوڕە سواران**
**گەڕی شاییم لە پێش چاوی گەراوە**
**لەرەی مەم ، سووکە ڕەوتی گوێ بە گواران**

ـ لێرەدا دەمەوێ ئەوەش بلێم لە پێشدا باسی وێنەکێشو شاعیرمان کرد وە تا ڕادەیەکیش پەنجەمان بۆ چەند خالێکی بچوك درێژ کرد لە ڕووی جیاوازی لە نێوانیاندا ، بەلام دەبێ ئەوەش بزانین کە ئاسۆێ ووشەلە ئاستی ستایشو وەرگێرانی ئەو وێنانەی شاعیر مەبەستیەتی کە دەری ببڕێت لە درێژاییو پانایی‌دا ، دوور ترو بەرین ترە ، زیاتر بۆ قولایی شتەکان شۆڕ دەبێتەوە چونکە هەر تابلۆیێکی ڕووت نیەو بەس ، بەلکو لەم دوورگەیە ڕەت دەکاو تێپەڕ دەبێت ، هەر وەکو یوسف عبد المسیح ثروت دەلێ :

شیعر سروشتێکی هونەری تایبەتی فرەوانی هەیە لە کاری لایەنەکانی تری ژیان ردت دەکاو دەچێتە ناخو ناوەوەی شتەکان ، واتە شیعر ( وێنەیەکی دەنگدارە ) ڕەنگدانەوەی ژیانمان پێ نیشان دەدات » (٤)

ئەی ( شێرکۆ بێکەس ) ی شاعیریش ، چۆن بۆ دەرووی هەر دوو لایەن شۆڕ دەبێتەوە، لە یەکەمیاندا وێنەیەکی بە چاو بیندراو وە لە دووەمیاندا هەلسوکەوتی لەگەل وێنەیەکی فۆلکلوری کوردەواریماندا کردووە کە خوێندەوار بەرەو دەریایەکی بێ بن دەبا بۆ ئەوەی بە دوای مرواریەکانیدا بگەڕێت ، ئەگەر ( داس ) کۆم بووبێتەوە لە دروێنەدا، ئەم ژیانە کۆم بوونەوەی هەر بۆ ( داس ) نیە بەلکو ئەو مرۆڤەش کۆم ددکاتەوە کە داسەکەی بە دەستەوەیە ، لە هەمان پارچە شیعر دا زامی ( هەلەکۆك )زۆر گەورەیە ، ئەو هەلەکۆکەی کە لەوەرزی زستان لە ژێر بەفردا چەکەرە دەر دەکات ، بەفریش دەچێتە داخوازیو داوای لێدەکات شووی پێ بکات ، بەلام هەلەکۆك وەلامی دەداتەوەو پێی دەلێت من هێشتا قژم بەر نەداوەتەوەو بچوکم لە بەهاردا شوت پێ دەکەم وەرزی بەهاریش دێت .. هەلەکۆك بە بەفرەکە دەلێت ئنجا خۆت ئامادەکە ئەوە ڕسکاومو پرچم لە بەر پێمدا دەخشێ،بەفرەکەش دەلێت لە دوای چی .. ؟ ئەوە من توامەوە .

**« بە ( داس ) م ووت**
**لەبەر چی وا کۆم بویتەوە**
**ووتی : لە درویێنەدا وام لێ هات !**
**بە ( هەلەکۆك ) م ووت**

**تۆ بۆچی وا تەمەن کورتی ؟**
**ووتی : بۆچی لە دوای بەفر**
**ژیان تامی تیا نامێنێ » (٥)**

ـ ژیانی شاعیر پڕیەتی لە کارەسات و ئەشکنجەو گریان و پێکەنین ، شاعیر ڕێبوارێکە لە تورەگەی دڵ و دەروونیدا بە سەدان وێنەی جۆراو جۆرو یادگاری بە جێماو داخون کراوە ، تا نۆتەو دلە کۆتەی مابێ ئەم وێنانە بە دامێنی پێنووسەکەی دێتە خوارەوە .

ـ دەبا سەیرێکی وێنەی ئێستاو رابوردووی شاعیر ( ژ . ح . ب ) بکەین ، کاتێ بەو هەستە ناسکەیەوە بیرەوەریەکانی ساڵانی لاویەتی و ئێستاکەی پیریەتی بە دوو وێنەی جیا لە قۆزاخەی پارچە شیعرێدا یە یەکەوەی بەستاون .

بەڵێ .. ( کۆتەرە ) ئەو دارە سەوزە بووە لە کاتێ هەرەتی هەڵچوون و رسکاندا ، بەڵام تەوری بێ بەزەیی جەرگی بڕیوەو لە سەر لاتەنشتێ بارانی بێ دەکەوێت ، جاران باوەشی لە پەڵە هەور و شینایی ئاسمان وەر دەهێنا ، سرووەو شنە ، گەڵاکانی بە لەنجەو لار دەلەراندەوە کەچی ئێستاکە بە رووێکی ووشک و زەرد هەڵگەڕاو ڕاکشاوە .. چەند بە پڕ توانایی و میهرەوە ئەو وێنەیە دەنەخشێنێ .. ووردە ووردەش لە زامی یادەکانیدا تکەی خوێن و فرمێسکی رۆژانی دلداری و ئەوینی لە گەڵ ست ( بەردی ) دا دادەچۆڕێ ...

**« وەك کۆتەرەی بەر باران**
**هیچ شتێك نابینم وەك جاران**
**نە ئاسمان ئەو ئاسمانی زووە**
**نە دار ئەو دارو بەردووە**
**نە باخ وەك جارانە رەنگ و بۆی**
**نە من ئەو منم نە تۆ ئەوتۆی**
**گیانەکەم ( بە دری )**
**دلم خوڕ خوڕ ئەگری » (٦)**

ـ ئەو وەختەی خاك و دووری ولات لە دڵی شاعیرێ گڵپە دەستێنێ و دلە بە خورپەکەی لە سۆزا عیشقێکی پاکدا دەگەوزێنێ بە جۆرێ لە ناو وێنەو دیمەنی جێ نزرگە دلگیرەکەی گینگڵ بداو هەر لەناو دەروونی خۆیدا ئەو سەرو ئەو سەری بێ بکات ، بۆیە عبداللە پەشێوی شاعیر ، ئاواتی ئەو بەیانیانە دەخوازێ کەوا لە دوورەوە دەبینێ ، ئەو گیا سەوزی بەسەر پشتی خاکە پیرۆزەکەیەوە ، سرووە دەیلەرێنێتەوە ، دەبێ بۆنی سینەو مەمانی ئەو خاکە چۆن شاعیر مەست کات ؟ تامی ئەو گیایە چ وێنەیێ دروست کات ؟ ووشە هارەکانی چ دامەزرێنێ ؟ دەبا چاو بدەینە بەر تافگەی شیعرەکەی کاتێ دەڵێت :

**« ئەگەر ئەمجارە بێمەوە**
**بەیانیان ، وەك بەرخۆلەیەکی ساوا**
**لە ناو قەرسیلی پاراوا**
**تل دەخۆم و گیایێکی تفت تێر تێر دەجووم**
**بە ئەنقەست .. قاچم تا بەلەك**
**لە شەونمی سارد هەڵدەسووم » (٧)**

ـ وێنەی خەونی رۆژانی منداڵی و ساکاری ، رۆژانی بێ گەردو دوور لە ناسۆرو خەمی سەردەمی جەنجاڵ ، لە زۆربەی هۆنراوەکانی شاعیرانی هەموو دونیا رەنگی داوەتەوە ( لەتیف هەلمەت ) ئەو رۆژانەی فەرامۆش نەکردووە ، وەکو ئیمرۆو دوێنێ لەبەر چاویەتی لەو کاتانەی رێژنەی بارانی بەهار لە داڕژانیدا کپ بووەتەوە ، پەڵە هەورەکان کۆچ و کۆچباریان تێك ناوە ، ئەویش دابقەڵاشتووە بۆ ناو کۆڵان و پڕ بە گەرووی هاواری کردووە ( رۆژ هەڵات .. مام ریوی لە کوون دەرهات ) لە دوایدا کە سەیری ئاسۆی دەم کەلی کردووە ، چەپکێ داوی رەنگاو رەنگی تێك ئاڵاو بانگیان کردووە ( لەتیف ) ە لاسارەکە زووکە باڵ بگرەو وەرە سەر شانمان بە بێ ئەوەی ئەو وەخت پێ بزانێ ووشەی پەلکە زێرینە چیە ؟ لەم پارچە شیعرەیدا دەبینین دەگەڕێتەوە بۆ ئەو رۆژانەی پاك و رووناك بوون .. رۆژانی منداڵیەتی ...

**« بە منداڵی کە پەلکە زێرینەی ساماڵ**
**ئاسۆی دەگرت وەك ڕەوە پەپولەی خەیاڵ**
**حەزم دەکرد وەك مەل بدەم لە شەقەی باڵ**
**بڕۆم .. بڕۆم .. وەها هەڵفڕم بۆ بەرز**
**هیچ سیمرخێ نەمهێنێتەوە بۆ سەر ئەرز »(٨)**

انور قادر محمد دلی دەبێتە کڵێساو لە عیشقێکی خوایی و سوتانێکی پڕ لە خۆشەویستیدا باوەش بۆ ئەو کۆترە شینکانە دەکاتەوە ، ئەو کۆترانەی جێگای بەرز وەك منارەو گومەز ، یاخود ئەو شوێنە کپ و هێمنانە دەکەن بە دالدەو لێوەی هەڵدەنیشن ، چونکە ئەو شوێنانە دەستی مرۆڤی دڵ رەق و بێ بەزەییان ناگاتێ ...

دیارە ( مەسیح ) یش هەر وەکو ئەو کۆترە شینکانە بێ تاوان بووەو بە دەورەی دڵێ خولی خواردووەتەوە

بۆ ئەڤین‌و شادی مرۆڤ ، ملوانکەی ژانێکی گەورەی بە خاچ وەکردووە ، شەویش وادەکشێ‌و تاریکییەکەی بەسەر هەموون کون‌و قوژبنێکدا دابەش دەکات بەڵام هەتاو ئەو ڕاوکەرەیە تیشکەکانی دەکاتە مەقەست بۆ قرتاندنی داوەرەشەکانی تاریکی‌و بەردەبێتە گیانیان ، هەر وەکو لەم وێنە شیعرەی‌دا وا دەردەکەوێت .

**« کۆترە شینکی ئێسك سووکی ژانی مەسیح**
**بە دەوری کەنیسەی دلما خول ئەخـواتـو هـــەر ئەگمێنێ**

**شەو داوێکە ملی سپی بەرە بەیانی**
**ئەم جیهانە ئەتاسێنێ**
**تیشکی هەتاو .. مەقەستێکە**
**هەموو داوێ ئەقرتێنێ »(٩)**

ـ بەتەنیا ووشـــەی ( ئێوارە ) وێنەیەکـــی سەربەخۆی خەماوی‌یە لە لای شاعیران ، تیشکـــە زێڕینەکانی خۆر وەکو خێڵەکیەکان هەوار چـــۆڵ دەکەن ، بار تێك دەنێن بە جۆرێ بە وێنەیەکی ناسك‌و بلێسەدارا ( صلاح شوان ) ی شاعیر دەباتەوە کەناری ئەو رووبارەی ئێوارەیێ لە ئێواران بـــە شەپۆلـــە وەنەوشەییەکانی یاری بە دلە خێزاویەکەی کردووە ، یان دەکات‌و هەزار بارەش دەبێتەوە ، بە درێژایی ئەو تەمەنەی بۆ شاعیر ماوەتەوە ، لە لایەکی تریشەوە رەنگدانەوەی ئەو خۆرە زەردەی وەك زەردێنەیێ دیار بووە بە سەر ئاوەوە ، نەخێر ئەو زەردێنەیە دلی شاعیرە ، وورده وورده تیشکەکان ئاوا دەبن‌و لە کۆچ کردن واز ناهێنن بەبێ ئەوەی بە لای کـــەنارەوەش هەنگاوێ بهاوێژن ، شاعیریش دەگری‌و وێنەکانی ئەم ئێوارەیەش باوەش بە یەك ددکەن .

**« ئێوارەیەو**
**شەپۆل یاری بە زەردێنەی دلم ئەکا**
**تریفەیەکی ماندووەو**
**بارو بارگەی خۆی لێنەخاتو لەسەر خۆ**
**روو لە ئاسۆی خۆرنشینی**
**ئەم رۆژگارە ئەڕوات ، بەر**
**بە لای کەنارەوە ناکا » (١٠)**

( سعد الله پەرۆش ) ، دلدارەو عاشقێکی دل گەرمە شەوان لە ئاگردانی دلە شەیداکـــەی پۆلوی گەشاوە پریشکی بە چوار دەوری خۆی بلاو دەکاتەوە، لەگەل نەرمە بای یادو بیرەوەریەکانی‌دا دەبێتە چراو دادەگیرسێ ، هەر لە دێر زەمانەوە رەشەبا ، دژ بە رۆناهی وەستاوەو بە دوای کوژانەوەی‌دا گەڕاوە ، بۆیە لەم شەوەی شاعیردا رەشەبا دەست لە ئەوکی چرای لێکدانەوەی دەنێ ، بەڵام دیارە لە لای شاعیر چراکە هەر داگیرساوەیە ، بۆیە یاری بە رۆناکیەکانی دەکات وەکو لەم وێنە چاو گەشاوەیەدا دەلێت :

**« ئەم شەوە چرامو رەشەبا**
**داگیرسانم دەخنکێنێ**
**ئەم شەوە چرامو رەشەبا**
**یاری بە رۆناکیم دەکا » (١١)**

ـ وەکو شتێکی مادی‌و بیندراو ، ئاشکرایە کە ئەو منداڵەی بازنەیێکی بچکۆلانەیان لە دەستکردووە لە کاتی خۆی‌دا ، وەختێ ئەو منداڵە گەورە دەبێت بازوو و مەچەکیشی ئەستوورتر دەبێت ، ئینجا ئەو بازنەیە وا نقومی ناو گۆشتەکەی دەبێت هەندێ جار مەگەر هەر بە برینەوە لە مەچەکی دەربهێنرێ ئەگینا دەرناچێت .

( محمد حمەباقی ) ی شاعیر ، زۆر بە ووردی مامەلەی لەگەل ئەم وێنەیە کردووە،لە شوێن مەچەکی ئەو منداڵە ڕوحی جێگاکەی گرتووتەوە کە ئەویش لە سەرەتای عیشقە پیرۆز و خاوێنەکەی‌دا باریك‌بووە ، بەڵام لەگەل بەرز بوونەوەی هەڵاوەی مەشخـــەلای خۆشەویستیەکەی‌دا ، وورد؛ وورده ڕوحەکـــەی گەورە بووەو بە جۆرێ نە بازنی عیشقەکەی دێتەدەر وە نە هیچ دەستێکیش دەیکاتێ‌بازنەکە ببڕێتـــەوە بۆیە دەلێت :

**ئەلێی ئەو بازنی عەشقەیت**
**بە منالی کراویتە مەچەکی باریکی ڕوحم**
**ئێستا ڕوحم گەورە بووەو تیا دەرنایەیت ! (١٢)**

ـ ( ئەوزاد رفعت ) دیارە ئەوە دەزانێ کـــە خۆشەوستی و دلداری لە لای شاعیری زۆر جیاوازی هەیە لەگەل خالکی تری ئاسایی ، چونکە شاعیر بـــە هۆشمەندیەوە یاخود بلێین بە ( وعی ) یەوە بۆ نـــاو ئەو چالە قوولە شـــوڕ دەبێتەوە ، ئنجـــا ئـــەم خۆشەویستیە هەر چ جۆرە خۆشەویستیێ بێت ، بۆیە وێنەیێکی ناسکی لـــە سەر بالـــی پەپولەیێ هەلکەندووە ، گومان لەوەش دانیە کەبالی پەپولەش زۆرناسکە ، لە لای کاك نوزاو ئەگەر هەموو خەلـــك ناوی دلدارەکانیان بۆ یادگاری‌و هەناسەدان لە سەر درەختەکان هەلکەنن ، پێویستە بۆ سەلماندنی ئەو ئەڤینە گەورەیەی خۆی ، وەکو شاعیرێك لە ســـەر

ئیسقان هەڵیبکەنێ کە سەودا سەری بووە وەکو دەڵێت :

**« گیانە هەموو خەڵك ناوی**
**دڵدارەکانیان لە درەخت هەڵدەکەنن !**
**ئەی گیانە بۆ**
**من ناوی تۆ**
**لە ئیسقانم هەڵنەکەنم (١٣)**

ـ کاك کمال میراودەلی وێنەی گوندێکی شاخاوی دەکێشێ لەو بەیانیە زووەی کە تازە ئاسۆ برژانگەکانی دەتروکێنێو سوخمە تەڵخو ڕەشتاڵەکەی لەسەر ئەو بەفرە سینگ سپییە لادەدا ، کاتێکیش شاعیر شۆڕ دەبێتەوە بۆ سەر ئەو رووباردی نزیك ماڵەکەیان تا دەمو چاوی بشوات ئەو کاتە هۆ هۆی جوتیاران و هاژەو خوڕەی رووبارو جریوەی باڵندەو قاسپەی کەوەکان سەر مەستی دەکەن ، بەڵێ چەند وێنەیەکی تێکەڵاو بەیەکن لەم پارچە شیعرەدا سەری هەڵداوە .

**« چیا باوەشی کردەوە لە خۆشی**
**قاسپە قاسپی کەو**
**سوخمەی تەڵخی**
**لادا لە سەر سنگی سپی ،**
**هۆ هۆی جوتیار**
**لەگەڵ هاژەو خوڕەی رووبار**
**تێکەڵ بوونو کۆتاییهات :**
**پەردەیەکی تری کپی » (١٤)**

ـ وێنە یە هەر دوو دیوەکەیەوە ، دیوی دەرەوە ، وەکو وێنەیەکی فۆتوگرانی مجرد ، وە دیوی زوورەوە کە ئەوەش دڵی شاعیرە ، کۆشکێکا پڕیەتی لە نهێنیو ئەفسونو تەلیسمی تەلبەند ، ئەگەر هەر خۆی شاعیر ئەو لەغزانە بدرکێنێ ،

کاك ( عبد الکریم دەشتی ) ئەویش وێنەی سەر کانیو ئێوارانی گوندێ دەنەخشێنێ کە کچۆلەکان جەڕەو گوزەکانیان بە سەر شانەوەیەو بەرەو رووی دەچن ، کانیش لە خۆشیان لە شاییو سەرچۆپی دایە ، بەڵام لە دوایدا کە بە تەنها دەمێنێتەوە ئەو سەر چۆپییەی لە دەست دەچێ چونکە کەس بە تەنها شایی نەکردووە .. تا ئێرە شاعیر دێنەیەکی مجرد دەگێڕێتەوە ، بەڵام دەبێنین بەوەندەوە ناوەستێ دڵی خۆی لە شوێن ئەو کانیە داناوەو تیایدا تواوەتەوە چونکە هەر سەر کانی چۆڵ نابێ بەلکو ئەو دڵەی شاعیریش چۆڵ دەبێ کاتێ کچۆلەکان بەرەو ماڵ دەگەڕێنەوەو کپیو بێدەنگی شاباڵی بەسەر گوندەکەدا رادەکێشێ ئەوەتە دەڵێت :

**« دڵم وەکو کانی گوندێکی بچووکە**
**کەئێواران پاش هەزاران جەڕەو گوزەی کچۆلەکان**
**سەرچۆپی لە دەست دەرنەچێو بە تەنها**
**نەمێنێتەوە (١٥)**

لە کۆتاییدا هیوادارم لەم نووسینەدا توانیبم سوودێکم بە خوێنەواران گەیاند بێ ، هەر چەندە ئەو نمونە شیعریانەی لەم باسەدا هێناومەتەوە ، کەم بوون ، چونکە بە چەندان وێنە شیعری تری ئەو شاعیرانەی کە لێردا ناویان نەهاتووە لەم رووەوە لەبەر دەستم بوون ، بەڵام لەبەر درێژ دادریو فرەوانی نووسینەکە بۆ هەڵێکیتر هەڵگرتن .

**سەرچاوەکان**

(١) بۆدلێر ـ بقلمه ـ ل ١٣٣
(٢) دیوانی بەهەشتو یادگاری ـ گۆران ـ ل ٣٩
(٣) واقعیه بلا ضفاف ـ روجیه جارودی ـ ل ١١
(٤) الشعر والفنون ـ مختارات من الابحاث ـ ل١٣٨
(٥) پاشکۆی عیراق ـ ژمارە ـ ١٦ سالی ١٩٧٨
(٦) دیوانی ( چەپکێك هۆنراوە ) ـ ل ١٤
(٧) گوڤاری بەیان ـ ژ مارە ٣٥ سالی ١٩٧٦ ـ ل٢٤
(٨) دیوانی ـ پرچی ئەو کچە ڕەشماڵی گەرمیانو کوێستانمە ـ لەتیف هەملەت ل ٣١
(٩) دیوانی ـ زریان ـ ئەنوەر قادر محەمەد ـ ل٦٨
(١٠) گۆڤاری بەیان ـ ژمارە ٤٣ سالی ١٩٧٧ ـ ل٥٧
(١١) گۆڤاری بەیان ژمارە ٤٨ سالی ١٩٧٨ ـ ل ٣٥
(١٢) گۆڤاری بەیان ـ ژمارە ٤٤ سالی ١٩٧٨ ـ ل٧١
(١٣) دیوانی ـ دارستانی ئەو ـ بنارە ـ نوزاد رەفعەت ـ ل ٦٤
(١٤) دیوانی ـ بارانی پەڵە هەورێکی کۆچەری ـ کەمال میراودەلی ـ ل ٧
(١٥) گۆڤاری بەیان ـ ژمارە ٤٩ ـ ١٩٧٨ ـ ل٣٢

# «ئەسپ» وچەند سەرنجێکی ڕاگوزاری

ڕەئووف بێگەرد




ئەحمەد محمد اسماعیل لەو چیرۆکنووسە کوردانەیە که بە دلسۆزی‌یەوە شانی وە بەر کارەکەی داوەو لە گەلیدا دەژی ، ئەو گۆڕانە بەردەوامەی سەرجەمی بەرهەمەکانی گرتوتەوە ، لە یەکەمیانەوە ــ دارەکەی بەر مالمان ــ تا ــ ئەسپ ــ ی ئەم دوایەی ، نموونەیەکی گەشن لە هەنگاوی بەرەو پێشەوە چوونو سەرکەوتوویی ، چ لە هەلبژاردنی بابەتداو چ لەو تەکنیکە جۆربەجۆرانەی هونەری کورتە چیرۆکی خەملاندوە ، ئەمە بەلگەی خۆیی گەیاندنو گەڕانی بەردەوامی نووسەرە بەو لایەنە ئەدەبیەدا کە خۆی بۆ تەرخان کردووە . بۆیە ڕادەربڕینو دوان لەسەر دوا بەرهەمیم بە کارێکی پەسەندو پێویست زانی ، ئەگەرچی ئەم چەند سەرنجە ڕاگوزاری‌یە ناگاتە ڕەخنەیەکی زانستیانە کە پسپۆرێك دەستی بۆ کێشابێت ، چونکە ڕەخنەی ئەدەبی زیاد لەمە قوول بوونەوەو توێژینەوەی گەرەکە ، پێداچوو نەوەی بەرهەمەکانی لەمەوپێش نووسەرو لێکدانەوەیەکی مێژوویی ئەو بارو دۆخەی ئەوێت کە بەرهەمەکەی دروستکردووە ، بەلام لەگەل نەبوونی ئەو ڕەخنەگرە پسپۆڕانەدا پشت لێ‌کردنەوەو بێ دەنگی ئێمەش ــ هیچ نەبێت بە چەند سەرنجێك ئەوەندەی تر بەرهەمی هونەریمان لە جەماوەر دوورئەخاتەوەو زۆرنابات لەیاد ئەکرێت ، ئەگەر مەبەستێکی ڕەخنە پێناسینو دەستگیرۆ یی خوێندەوار بی بۆ کارەکە ، بابەلای‌کەمەوە ئەم سەرنجانە ئەو مەبەستە بهێننەدی. ئەبی ئەوەیش لە یادنەکەین کە ئەم شێوە لەسەر نووسینە سیمای ڕۆژنامەیی هەیە ، زیاتر پێداچوونەوە و پێناسی کردنە، جۆریکە لەو لەسەر نووسینە باوانەی ئێستا لە ئەدەبی پێشکەوتوی جیهاندا باوە ، لەپال ڕەخنەو لێکۆلینەوەدا . ئەشێت ئەم بابەتە نووسینە سەرنجی ڕەخنەیی تیا بێت ، بەلام ــ وەك سەرەتا وتم ــ ڕەخنەو لێکۆلینەوە ی ئەدەبی نی‌یە بەو پێوانەیەی بۆ ئەو لایەنە گەورەیەی هونەر تەرخان کراوە .

کۆمەلە چیرۆکی ــ ئەسپ ــ هەشت چیرۆکی کورتنو بە دوو ئوسلوبی واقیعی‌و ڕەمزی نووسراون ، ڕووداوەکانی ئەم کۆمەلە چیرۆکە لەباری دەروونی‌و سیمای کۆمەلایەتی پالەوانەکانیەوە ، هەمان جیهانی پێشوون کە نووسەر لە کۆمەلە چیرۆکی دووەمیدا ــ دەستی ئۆخەی ــ دیاری‌کردوون . بێجگە لەوەی کە ــئەسپــ تەواوکەرێکی فیکری ــدەستی ئۆخەیــ

نووسەرەو لەو بەرچاو ڕوونیو خۆگرتنەو پێداگرتنەدانە براوە کە کۆمەلە چیرۆکی پێشوویدا خۆی پێوە بەستبوو : زوربەی ناوکی باسەکانی ڕووداوی - واقیعیەنو نووسەر لە ئەنجامە موعاناتی تایبەتی کارەساتو هۆشمەندی خۆیەوە هەڵیبژاردوون ، ئەمە بۆتە هۆی ڕەوانی ئوسلوبو بێ گریو گۆلی لە تێگەیشتندا ، واتا ئەو پەیوەندییە دیالەکتیکییەی لە نێوان فۆرمو ناودرۆك دایە هەست بە سەرکردنی لایەکیان بەسەر ئەوی تردا ناکەیت .

ئەوەی لەم چیرۆکانەداو لەسەر جەم بەرهەمەکانی نووسەر شارەزابێت هەست بەوە دەکات کە چیرۆك نووسانە مامەلە لەگەڵ ڕووداودا ئەکات ، ناوەرۆکی چیرۆکەکان نامۆنینو لە دەورو بەرماندا دەژین . نووسەر لەڕێگای پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکانەوە نموونەی ئینسانیمان دەخاتە بەر دەست ، مەسەلەکان پەیوەندیان بە مرۆڤەوەیەو هەر لەویشەوە سەرچاوەی هەموو کارو بزوتنەوەیەك دەستپێدەکات ، زۆر لە ڕووداوەکان لای خوێنەوار دەمێننەوە ( هەباس ، تابلۆیەکی سوریالی ، ڕێگاو سەرمایەکی ناکاو ، یەکەمو سێیەمی کورتەی چوار چیرۆکی درێژ ) .

یان نووسەر ڕاستەوخۆ خۆی لە ناو ڕووداوەکەدا ژیاوە و هەندێك جار ئەبێتە پاڵەوانی سەرکی ، تەنانەت وەك نووسەریش ( ٣ هۆڵ ، کارەساتی قارەمانیناو چیروکە ، کە بێ دەنگی هێرش دەبا ) نووسەر ئەوەندی لە قۆستنەوەی هەندێك حاڵەتی ئینسانیدا وەك چیرۆکی - واقیعی - بە سەلیقەیە ، کەئەمە خاسیەتێکی چاکی هەر چیرۆك نووسێکە ، لە ئوسلوبی ڕەمزیدا ئەو گەشاوەیو سەرکەوتنە نابینین کە پاشان لێی دەدوێین .

لە چیرۆکی - ٣ هۆلدا - پێنج پیاو خۆیان بە سەماگایەکدا دەکەن ئەمیان - نووسەر - لە دوانیان دائەبڕێو لەگەڵ دوانەکەی تردا (لەوە ئەکات ئەوانیش نووسەر بن ) ئەکەونە پێك هەڵدان ، بەدەم تەماشا کردنی ئافرەتە سەماکەرەکانەوە ، خولیاو ئازارە پەنگ خواردووەکانیان بە هەراو ووردە پەراوێزی بەر خۆیانەو هەڵئەڕێژن ، ئەکەونە ووڕێنەی سەر خۆشی ، یەکێکیان شاعیرە ، ئەیەوێت ( لە نزیکەوە شارەزای ئافرەتێك بێت تا لە شیعرێکدا دەری ببڕێت ) . ئەوی تریان تەنیاسەرخۆشی مەبەستە بۆ ئەوەی بتریقێتەوەو گاڵتە بەخۆیان بکات ، ئەمیش

- نووسەر - وەك یەکەم حەز لە ئافرەت دەکاتو چەشنی دووەمیش گومان لە هەموو ژیان دەکات ( تۆ بڵێی یەکێ لەم سێ هۆلە ڕاست گۆ نەبێت ؟ ! ! یا کام تریقانەوە لە هەمووی ڕاستتر بێ ؟ ! ) ، گومانەکە پاشان ئەبێتە حەقیقەت و ژیان لای ئەمیش دۆخەیەو یەکسانە بە سەماخانە : ( کرێکارێکی کلۆلێ تاکو ناخ مەستیش تازە نیازی چوونە ژوورەوەی بوو ، بەمەبەستی خۆدزینەوە لە هۆلی چوارەم ) . پەنا بردنە بەر کرێکارێك بۆسەپاندنی ئەو - ڕاستی - یە ی ئەیەوێت ، مەودایەکی گەورەوفراوانتر ئەداتە مەبەستەکە ،چونکە ئەگەر کارگەو ئارەق ڕشتنیو چەوساندنەوەی مرۆڤێك - هۆلی چوارەم - ی بێ هوودەی بێت ، چی بۆ جوامێریو خۆبەختکردنو گەورەیی مرۆڤ دەمێنێتەوە ! . ڕەنگە نووسەر بڵێت من ڕووداوەکەم وەك خۆی گێڕاوەتەوەو ئەو مەبەستە منیە ، بەلام وێنە گرتنی ژیان ودك خۆیو بێ دەستکاری نەکردن ، کارەکەبێمەبەست ئەهێڵێتەوە، گوێزانەوەی ڕووداێك - وەك خۆی - بۆ جیهانی هونەر باساو بۆبویانی هونەرەکە هەر ناهێڵێتەوە ، ئەمەیە مەترسی فوتوگرافیەت لە ئەدەبداو هەندێك بۆچوونی ئەزۆکانە کە ئەمە بە واقیعیەت ئەزانن‌و ڕێگای دەستکارییو زاتی نووسەری لێ هەڵدەبوێرن .

لە چیرۆکی - ڕێگاو سەرمایەکی ناکاو - دا نووسەربە زمانێکی شەفافو سادەی - کەسی سێیەمی تاکەوە - وادەی ژوانی ( کچو کوڕێك ) یا ( ژنو پیاوێك ) باسی دەکات ، کات پاییزێکی درەنگە ، شوێن شارێکی کوردەوارییە ، سەرمایەکی ناوەختو بارانێکی لێزمە دەبارێت ، ئافرەتەکە بە نامەیەك جێ ژوانی دیاری کردووە کە باخچەیەکی دووری قەراخ شارە ، بەلام کاتی تیانی یە ، - کوڕە - یان پیاوە - گوێ بە سەرماو باران نادات‌و بەرەو باخچەکە دەکشێت، لە ڕێگا چەند دیمەنێك دەکەونە بەر تۆماری هەستی ، نووسەر ئەیان گوێزێتەوە ناو کارەکەی ( درەختو گەلاو باران ، حەماڵێك ، قوتابییەك ، ئوتومبیلەکان دیمەنی شەقامەکە ) . لە ڕێی بەکارهێنانی مەنەلۆژو گوێزانەوەی زەمەنی ڕووداو لە سەرەتاوە بۆ کۆتاییو بە پێچەوانەوە ، دۆخێکی تەواو ئالوودەو خۆشی بۆ چیرۆکەکەی ڕەخساندووە ، ئەم دوو ڕەگەزە ( مەنەلۆژویاری بە کات کردن ) زیاتر چالاکی ئەداتە خوێندەوارو لە بێزارییو هەناسە سواری دووری دەخاتەوە .

لەم چیرۆکەدا نەپێناسی پالەوانەکـــە دبـــارە ( قوتابی‌یەیان مامۆستا ) نە ئافرەتەکە ئایا کچــــە قوتابی‌یەو پەیوەندی‌یەکەیان خۆشەویستی‌یەکی گیانی ڕووتە ، یائافرەتێکی سۆزانی‌یەو پەیوەندی‌کە تەنیـا ـ سێکس ـ ە ؟ .

لە سەرەتاوە هەست بەو پاکی خۆشەویستی‌یە دەکەین کەرەنگەلەنێوان دوو قوتابی دابێت ، کە دێیتە دوا پەرەگرانی مەنـەلۆژێکی درێژی کـــوڕەکـــە مەبەستەکەت لێ چەواشە دەبێت‌و کارەکە دەبێتـــە سێکس ، یاگوێ لە کورەکە بگرین :

( هەناسە برکێ‌و مانـدوویەتـــی ڕێگاکە تـــا سەرماکەی ئەمڕوش لە باوەش گەرمی‌دا لە بیر خۆمی دەبەمەوە ، چمکی بەرگە کوردی‌یە ســــەوزو زەردو سوورەکەی دەکەم بە چەتر بۆ هەردووکمان ، لەبـن دارێکی بـــەرداردا دەنیشین تامەزرۆیی چەند سالەی ژیانم دەشکینم ، ئینجا پیلان دادەنێم .. ئا . باسی ڕێگاکەی بۆدەکەم .. دواجا .. دواجاش .. ) .

رەنگە هەموو چیرۆکەکە بۆ ئەم ( دواجا ... دواجاش ) ە نووسرابێت ، کە مەبەست تێر کردنی ئارەزووە شەهوانی‌یەکەیەو بەس ، بەتایبەت کە هەر پاش تەواوبوونی مەنەلۆژەکە لەگەل کۆل هەلگرێکدا بەم جۆرە دەدوێت .

ـ ئەوەچی یە بە کۆلتەوە ؟

ـ پەینە بۆ باخچەکەی دەبەم

نیشان‌دانی دوو وێنەی دژ بە یەك لەیەك حالەتدا بۆ هەست ڕاگرتنی خوێنەوارو تێ گەیاندنی باریّ ئالۆزی کۆمەلە ئەم شێوە ئینتیقادی‌یە لە ئەدەبی کلاســیکی ـ بە تایبەت کورتە چیرۆك‌و شانۆگەری ـ داو زیاتر لە ئەدەبی سۆڤیەتدا گەلێك باوبووە، گۆگۆل‌و چیخوف ئەم لایەنەیان زۆر دەرخستووە ، نووسەری ئـــەم چیرۆکەیش ئەیەوێت پێمان بلێت : « لەکاتێکـــدا حەمالێکی هەژار بە تەکە تەك‌و بەم سەرماو بازانـە پەین بۆ باخچەیەك دەگوێزێتەوە ، یەکێکی تری وەك ئەو مرۆڤ کە سەر بە چینێکی ترە ، بۆ مرکردنـــی ئارەزوی سێکس هەر بۆ ئەویّ دەچێت ، هەریەکەیان نیازی جیایە، ئەمەیە ژیان لە کۆمەلگای چینایەتیدا» .

ئەگەر نووسەر ویستبێتی بە نیشان‌دانی ئـــەو دوو دیمەنە ـ موعادەلە ـ یەك لە نێوان پەیـــن‌و زەوی باخچەکە لەگەل ئافرەت‌و پیاوەکەدا دروستبکات ، ئەو لێکدانەوەیش جێ ناگرێت ، چونکە ئەگەرچـــی ئافرەت رەمزی پێت‌و مانەوەیەبەلآم لەو حالەتـەی ئێستایدا ـ وەك واقیمە هونەری‌یەکە دەری‌دەخات ـ ئەو ئافرەتە زیاتر رەمـزی نەزۆکی ئەگرێتە خـۆی نەك فەڕ . ئەگر چیرۆکـەکـە لایەنی جینســـی‌یەدا شکایەوە ، ئێمەیش دەگەڕێنیەوە سەر سەرەتـــای باسەکەمان لە چیرۆکی پێشودا ، کەئەمیش وێنەیەکی رووتی واقیمەو نووسەروەك خۆی هێناویەتی ، بۆیە نەوەك چیرۆکێکی جینسی تام‌و چێژی تایبەتی خۆی هەیەو نەوەك ڕووداوێکی عاتیفـی رووت ســـۆزو خۆشەویستیت نەجوولێنێت ، ساخ کردنەوەی ئەم لایەنە کارێکی هەرە پێویستی نووســــەرە بۆ ئەوەی خوێندەوار نەخاتـــە ناوگێژەنـــــی‌دوو دلـــی‌و چێزوەرگرتنەوە ، بۆ ئەوەیش یەك لایی نووســـەر دەرکەوێت‌و ئالۆزی لە فیکریدا بەری‌نەگریت . لـــە ( کورتەی چوار چیرۆکی یەجگار درێژدا ) کە چوارەکە کراوە بە سێ ، سێ حالەتی ئینسانی لەسێ وێنەی جیاوازدا پیشان دەدات ، ژن‌و مێردێکی تامەزرۆی مندال ، خەوی مندالێك ، حاجی لەق لەقێکی بـــێ تاوان کوژراو .

دەست خـستنە ســـەر پەیوەنـــدی‌یـــە مرۆڤایـەتـی‌کان‌و گوێزانـەوەیان بـــۆ جیهانـــی ئەدەب کارێکی چاکی نووسەرە ، جا ڕووداوەکان هەر لایەکیان هەبێت ، چاك یان خراپ ، ئازایەتی وتـــر سنۆکی ، خۆشەویستی‌و رق ، تـاوان‌و کـــارە مرۆڤایەتی‌یە هەرە مەزنەکان.چونکە ئینسان هەروەك تۆوی چاکەو گیانی مرۆڤایەتی تیایـــە ، خراپـــەو نا جوانمەردیش لایە ، ئەوەی بەڕاستی لە خولیـــاو ئەندیشەی مرۆڤ‌و باری دەروونی شـــارەزابێت ، هەرگیز داوای ـ سۆپەرمان ـ لە نووسەر ناکات ، مرۆڤ تەنیا قارەمان‌و خێر خوانی‌یە ، هەروەك لەم کۆمەلگایەدا چەندان رووداری ـ ئیجابی ـ ئەبینین ، دەیانی پێچەوانەیشی‌تیا ئەبینین ، کەواتـــە ئاسایە نووسەر دەست بۆ هەموو لایەنێکی درێژ بکات .

مام عەبدەل و ژنەکەی وەجاخ کوێرن ، هیوای هەر دوو لایان ئەوەیە مندالێکیان ببێت‌و مالەکەیان ئاوەدان بکاتەوە،بەلآم هۆی مندال نەبوونە کە دیارنی‌یە جارێك لە ( دەقی چیرۆکەکەوە )وادەرئەکەوێت کـــە عەبـــدەل تۆوێ پیاوەتـــی نی‌یـــە : ( هیچــــم لەپیاوان‌کەمترنی‌یە ، لە قۆل وەشاندن‌و ئیشو کاریشدا کەس پێم ناگات ، پیاوی رەش ، سپی ، هەمووتوانای

ئەوەیان هەیە منالیان بێ من نەبم .. ل ١٦ ) .
لە لایەکی ترەوەوەو هەر ( لەدەقیچیرۆکەکەوە )لەوە دەکات منالیان ببێت ، بەلام لەبار بچێت ( چەند جارم بێ ووتی دەمان بێت ، ئەمرۆ نەسبەی ، چەند جاریێ سکت پڕبوو ، بەلام بە نیوە چلی ل ١٦ ) ، عەبدەل بە ژنەکەی دەلێت : ( ئەمجارەیان بەنیوە چلی نابێتو منالێکی چاوگەشمان دەبێت . ل ١٧ ) .
لە باری یەکەمیاندا سۆزە مرۆڤایەتی‌یەکی خەست ترحالەتەکە لە ئامێز نەگرێت ، بەلام لە دووەمدا چار ئاسانەو ئەم کۆلە خەمەی ناوێت ، لە هەر دوو بارەکەدا نووسەر بە سەلیقەوە دەستی بۆ حالەتەکە درێژ کردووە ، ئەگەرچی زۆریش لە دەرگای ئەم جۆرە باسانەدراوە .

لەخەوە بێ سەرەو بەرەکەی ـ چالاکدا ـ نووسەر پەنائەباتە بەر فرۆید بۆ لێکدانەوەی خەوەکە، خەوبینین لای فروید بەگشتی [ رازی‌کردنێکی رەمزی‌یە بۆ بۆ حەزو ئارەزووە حەشاردراوەکانی مرۆڤ ] واتا ئەو هیواو ئاواتانەن کە لە واقعیدا خۆزگەیان پێ دەخوازێت،کەچی ئەنجامی چیرۆکەکە ـ بە پێی شی کردنەوەی نووسەر ـ ئەنجامی چەوری خواردنە : ( چەند جارم پێ ووتی ئێواران شتی چەور مەخۆ ل ١٨ ) ئەمەیان بڕوای ڤولیترە کە لای ئەو خەو بینن ( ئەنجامێکی بی سەرەو بەرەیەلە جوولەو کارەبایولوجی‌یەکانی لەشەوە پەیدا دەبێت ) .
لە چیرۆکی سێیەمیدا دوو یاساول بەلای ـ مزگەوتیکا تێ دەپەڕن ، لەق لەقێک بەسەر منارەیەکەوە نیشتۆتەوە ، بێ بەزەیی تەقەی لێدەکەنو خوێنی بەسەر منارەکەدا دەڕێژن ، دوو ڕێبواریش کە لەم لاوە چاوەڕوانی ئوتومبیلن بە حەپەساوی‌یەوە لەیەکتر ئەڕوانن‌و دەست بە جگەرەتێکردن دەکەنەوە ، نووسەر لەوە ئەکات دەستی تاوان بۆ دەسەلات درێژبکات ـ بەهینانی دوو یاساولەکە ـ یان دلرەقی‌و بێ بەزەیی مرۆڤمان بۆ دەربخات . بەلام بۆ ئەوەی یەکێتی بابەتەکە هەرسێ چیرۆکەکەمە بە یەکەوە بەستێت ئێمە دەست ئەخەینە سەر حالەتە ئینسانی‌یەکە کە لە کوشتنی پەلەوەرێکی بێ وەزەنەوە پێی دەگەین ، لەگەل ئەوەشدا ئەگەر لە دوانیاندا ( یەکەم‌و سێیەم ) ئەو حالەتە بکرێتە بنواشە بۆ یەکێتی بە کە ، ئەوا لە دووەمدا خۆی لەو دۆخو بارە نادات‌و تەنیا وێنەیەکی ـتجریدی ـ مان دێتە بەرچاو،

ئەم چیرۆکە زۆر کورتانە ئەگەرچی بە ناونیشانی لاوەکی‌و جیاواز سەربەخۆین لەبەر ئەوەی ناونیشانێکی سەرەکی یەکیان ئەخات ، ئەبێت یەك ـ ناوەرۆك ـ پێکیان بکەیەنێت ، واتا ناشێت چیرۆکێکی زۆر کورتی کۆمەلایەتی‌و یەکێکی تری سایکولوجی ، یان جینسی لەژێرناونیشانێکدابن‌ووەك چیرۆکێکی سەر بەخۆمامەلەیان لەگەلدا بکرێت ، لەم سێ چیرۆکەدا سۆزو هەستە مرۆڤایەتی‌یەکە لەدوانیاندا هەیەو ئەوی ناوەڕاستیان خەوێکی بێ مانایەو چیرۆکەکە بە ئەنجامی زۆر خۆری‌و شەو ترشاندنی داناوە .
ئەگەر چیرۆکەکان ـ مەودایەکی رەمزی ـ یان هەبێت ( ئەم لێکدانەونەیش‌لە کاری ئەدەب‌و هونەردا ئاساییەو باشترین کاری داهێنان ئەوەیە کە زیاد لە لێکدانەوەیەك هەلدەگرێت ) ، ئەگەر وابێت یەکێتی بابەتەکەزیاتر دروست دەبێتەو ئەم پرسپارانەیش بەلگەی پەیوەندی نێوانیانە .
مام عەبدەل کە تا ئێستا منالی نەبووە چۆن وا بەدل بنایەوە بە خێزانەکەی دەلێت ئەمجارە منالێکی چاوگەشمان ئەبێت ؟
ئەو وەیشوومەو کارەساتە گرانەی تووشی دایکی چالاك‌و خێزانەکەیان دەبێت بۆ ئەکرێتە کەرەسەیەکی هونەری‌و بەناوی خەوێکی سەیرەوە دەگێڕرێتەوە ؟
لەق لەقی سەر منارەی مزگەوتێك بۆ ئەبێت بکوژرێت ؟ .

لە ( کارەساتی قارەمانی ناو چیرۆکێك ) دا ئەحمەد چیرۆکێکی ـ تجریبی ـ ئەنووسێت ـ خودی نووسەر ـ پالەوانی سەرەکی‌یە ، خەم‌و خولیاو ئەندیشە تایبەتیەکانی لە ڕێگای خۆی‌و پالەوانی ناو چیرۆکێکی ترەوە دەردەبڕێت ، ئەبەوێت پەیوەندی‌یەك لە نێوان تایبەتی ـ کۆلە خەمەزتی یەکەی خۆی ـ وگشتی ـ خولیای مامۆستایەك کە پیشەی نۆتەو سروود دانانە بۆمندالی گوندەکە ـ دا دروست بکات ، ئاخۆ سەر ئەکەوێت ؟
لەم چیرۆکەدا کات‌و شوێن بەخەستی تێك چرژاون ( ئێستای گەورەیی‌و جارانی مندالی خۆی ، ئێردی نامۆو ئەوێی مەلبەندی ، کات‌و شوێن لەهەلس و کەوتی پالەوانی چیرۆکی ناوکتیبەکە ) .
نووسەر ( کەپالەوانی سەرەکی‌یە ) لەسەر جیگاکەی کەوتووە ، کات ( یەك‌و نیوی پاش نیوە شەوە ) .

بنچی ژوورەکەی کردۆتە شاشـەی سینەمـاو یاداشتەکانی تیا پیشان ئەداتەوە ، پالەوانی ناو ئەو کتێبەیش کە تازە خوێندویەتی‌یەوە مامۆستایەو دوای سەدان‌شەو نخونی جۆرە وانەو نۆتەیەکی بۆ منداڵان داناوە ، کەچی ڕێی نادەن بیان گەیەنێت ، ئەمە سەرجێکالە پاڵ ژوورکەیدا ئافرەتێـك بێشـکەرا دەژەنێت ، دەنگی ڕاژەندنەکە ئەی گێڕێتەوە بۆ دەوری منداڵی خۆی ، ئەم شـێوە گەڕاندنەوەیە لە تەکنیکی چیرۆکدا بە ( تداعی‌لێك چوو ) ناوەدەبرێت ، واتـا شتێك شتێکی‌تری وەك خۆیت دێنێتەوە یاد ، بیر ئەو ڕۆژانە دەکاتەوە کە لە منداڵیا بەچوکلێك دەرگای ماڵەکەیانی ئەکردەوە ، کەگەورەیش بوو دایکی ئەهاتە پیریەوەو دەرگای‌بۆئە کردەوە ، پاشان منداڵەکانی لە دەور دەناڵا و ئیستا لێرە ( ئەو شوێنەی جێگای کارو زیندەگی ئیستایەتی ) بێزارەو ئەیەوێت بۆ ناو ماڵو منداڵی بگەرێتەوە .

ئەم چیرۆکە لە حالە تێکی دەروونی نووسەر خۆی بەو لاوە مەودایەکی فیکری تیانی یە ، تەنانەت پالەوانی ناو کتێبەکەیش ( کە نۆتەو وانەی نووسیوە ) و چاوە ڕێی بوونی لەوەوە بکەینە مەبەستێك کە سەرجەمی بیر لێکدانەوەکانی نووسەر بێت‌و بمانگەیەنێتە حالەتە گشتی‌یەکە ، ئەویش هیچی لە دەست‌نایەت‌و بوونی لە قەبارەی چیرۆکەکەدا زیاد دەرەچێت ،

لە خوێندنەوەی چیرۆکی ـ تجریبی ـ دا ئەبـێ خوێندەوار پشوودرێژو خـۆ گربێت ، ئەگینـازوو بێزاری تەنگی پێ‌هە لدەچنێت ، نووسەر ڕووداوەکان زوزوو لێك ئـەترێنێت‌و جێ گۆڕکە بـە پالـەوان‌و شوێن ئەکات‌و هەلچوونـە دەروونی‌یەکانـی ئاوێتە ئەکات ، ئەمەیش کارێکی نابەجێ‌نی‌یە ، بەتایبەت کە بڕوامان بەوەبێت ژیان‌و هونەر پەیوەنـدی‌یەکـی جـەدەلیان لـە نێوانـدایە ژیانی ئالـۆزی واقیعیش ئاسایە هونەری ـ تجرید ـ ی لێ‌ببێت . ناوەرۆکی باسەکە بریتی‌یە لە ـ انفعالات ـ وتـە مبیرێکـی ڕاستەوخۆلەزات .

نووسەر لەگەڵ ئەوەیشدا ( ئەکەوانەو ئیشاراتی بۆ ئەو ئاڵو گۆڕانە دانە ناوە ) بە ئاسانی هەست بـە عەفەویەتی بازـدان‌و تەواوی ڕووداوەکە دەکـەین ، ئەبێت ئەوەیش لـەیاد نەکـەین کـە چیرۆك کاری ـ منطق‌و عەقڵە ـ و پشت بە خەیاڵو سـوزی بێ سنووری ئیلهام نابە ستێت ، تەنانەت لە چیرۆکـی ڕەمزیشدا ( ئەگەر دۆخ وجیهانە تایبەتیە کـە لـە بنەڕەتەوە لەسەر ناماقووڵ دانەمەزرابێت‌و دوانـی لەگەڵ سروشت‌و گیانداردا تیانە بێت )، لەوێشدائەبێ کارەکە لەرووی دەرەوەیدا جێگا بۆ گومان‌و دوو دلی نەهێلێتـەوە . ئاخۆ زلامێکی سپ‌و ساغ ئەتوانێت لە سەعات یەك‌و نیوی پاش نیوە شـەوەوە تا سـەعات هەشت‌و نیوی بەیانی لەسەر پشت بکەوێت‌و چاو لە بن‌میچی ژوورەکەی ببرێت : ( لێدانێکی تونـدی دەرگای ژوورەکـەی نەی‌هێشت وەرامەکان ببیـێ ، کە ڕاپەڕی‌کات درەنگ بوو ، بەپەلە خۆی لەبەر کردو بەرەو قوتا بخانە کەوتە ڕێ ل ٢٨ ) . نایش توانین بلێین خەوتووە ، چونکە رستەی ( نـەی هێشـت وەر امەکان ببیـێ ) بەلگە بە ئاگاییەتی ، ئەبـێ ئەوەیش بلێم کە پاش خوێندەنەوەی ئەم چیرۆکە ، چیرۆکی (القطار والسور)ی زهدی الداوددیم هاتەوە بیر، کە بەراوردم‌کردنەوە، دۆخ‌و زنجیرە ی‌ڕووداوەکان زۆر لەیەك دەکەن هەردوو کۆمەلە چیرۆکـەکـەیش ١٩٧٨ دەرچوون و ( ئەحمد ) ئەو چیرۆکەی بەبەر هەمی‌سالی ١٩٧٤ داناوە، کۆمەلە چیرۆکەکەی ئەحمد ( وەك من ئاگاداریم ) پاش‌دووساڵ مانەوەیش لـە دەزگای ڕۆشنبیری ئەوسا بۆی چاپ‌کرا .

نووسەر دێتە سەر ئوسـلوبـی ڕەمزو چیرۆکـی ـ ئەسپ ـ ئەنووسێت ، ئەسپەکەی ـ ئەحمەد ـ هەرلە ( گوندەکەی خۆیان ، ڕەسـەنی پێ گەیشتووە، بێجگە لە پاوەنی ئاغاکە لێ قەدەغەکراوە لەهەمـوو پاوەنێکی تردا لـەوەڕ یووە ، دانیشـتوان بـەدڵ خۆشیان ویستووە داخی ئەوەیە تاد وایی تووشـی سواری خۆی نەهات‌و لە کیس چوو ) .

ئەسپ لە ئەدەب‌و هونەری جیهانیـدا زۆرەو لای خۆیشمان هەندێـك دەسـتیان بۆ بردووە ، لـە هەمووی‌دا ڕەمزی هێزێکی گەورەیـە ، هەمـوو هیزێکیش لەهەر دەورو زەمانێکدابووبێت گەورەبوون‌و تەشەنە کردنی بەو بارو دۆخەوە بەستراوە تـەوە کەتیایا سـەری هەلـداوەو تیا هەلدەسـووڕێت ، بێجگە لەوەی کە دروست بوونی ئەبێت سەپاندنـی باری‌مەوزوعی‌و زالی بێت‌و لا بەلا خۆی ئەکوتابێتـە ناوەوە . کە ئەمە ئەبێتە کەرەسە بۆ کارێکی ئەدەبی ئاخۆ ئەو قۆناغی ( دروست بوون و گەلالەو تەشەنە کردنە ) ی وەك ڕاستی یەکی مێژوویی لە کارەکـەدا ڕەنگ ئەداتەوە یان ڕاستەو خۆ لەو ئەنجامەوە کـە

پێی گەیشتووە ؟ جانەنجامەکە مانەوەو پتەو بوونی هێزەکەیەیان کەوتن‌و پووکانەوەیەتی ؟ ئێمە لەگەڵ ئەدیب‌و هونەرمەندا مامەڵەی مێژوو نووسێک ناکەین ، بەڵام ئەدەب لەژیان دا نابڕێ‌و ڕاستی‌یە مێژوویەکەیش بەشێکە لێی .

ئەم لە ئەنجامەوە تێ هەڵچوون‌و گوێ نەدانە هۆو پێش بینین نەکردنە ، زۆرجار ئەکەوێتە کاری هونەری‌یەوەو نووسەر وێنەکە ( وەك ئەو کاتە ) ئەگرێت‌و ئەیداتە دەست خوێندەوار ، تەنانەت ئەگەر شتەکانی وەك خۆی نەهێنابێت ، وەك بڕوابوون‌و بۆچوونی خۆیشی کە دروست کردنەوەی ژیانە ، نەی توانیوە هێزی دەم کوت کردن‌و بڕوا کردنی خوێندەوار مسۆگەر بکات .

لە ئەسپ دا کارەساتەکە پەرەسەندنێکی هارمۆنی بە خۆیەوە نابینێت ، ڕەوانتری بڵێین : کە ڕووداوەکە ئەخەینە چوارچێوەی واقیعەوە بڕین‌و کەرت کردنی تێدەکەوێت کە لای خوێندەوار ئاثا سایی دەردەچێت، بابزانین چۆن ؟

خەڵکی گوندەکە ئەسپەکەیان زۆر خۆش دەوێت ، هەموو جەرگیان بۆی‌بووە بەناو سکی ماسی ، بەهی خۆیانی دەزانن ، ئەی چۆن بەرەڵا ئەکرێت‌و ئەبێتە گاڵتەجاڕی منالە ووردکە ؟ ئەگەر ئەسپەکە ڕەسەن بووە ( وەك خۆی دەڵێت ) و خۆشەیستی‌یەکە یشی لەو ڕەسەنی یەوە هاتووە ، بۆ دوای کەوتنی خۆشەویستی‌یەکەی نامێنێت ؟ ! . وادیارە خۆشەویستی‌یەکە لە سۆزێکی کاتی خەڵکەکەوە بووە ، لەئەنجامی تێکەیشتنێکی مەوزوعیانەو تاووتۆ کردنێکی زانستی‌دا پێی نەگەیشتووە ، دۆخێکی تایبەتی وابش لە چیرۆکەکەدا ئامادە نەکراوە ( کە ئەم کەوتن‌و ئاوی لووت بە « لیکی » لالفاوە تێکەڵ بوونەی لێ‌ پێش بینی بکرێت ) ، تابزانین ئاخۆ کەوتنی ئەسپەکە پەیوەندی بە دانیشتوانی گوندەکەوەیە یان دەستێکی لەسەرو ئەوانەوەیە ؟

سەرجەمی چیرۆکەکە ئەوە ناگەیەنێت کە نووسەر ـ گێڕانەوەی کارەساتەکە لە چیرۆکەکەدا بە زمانی ڕاناوی تاکی قسەکە رەوەیە ـ توانێبیتی لە مەودایەکی فیکری دیاردا بەرانبەر بە ئەسپەکە خۆی دۆزیبێتەوە. گومانی هەیە لە نێوان خەسان‌و نەخەسانیدا ، خۆش‌ویستن‌و نەویستندا . بۆ نموونە باگوێ لە دیالۆجی دانیشتووی گوندەکە بگرین :

ـ باوکم لەسەری گلاو مرد
ـ خالۆیەکی منیش
ـ جوانەمەرگەکەی برام بۆ نالێی ؟
ـ کەچی هەر خۆشتانیش دەوی ؟
ـ خۆشمان دەویست .

ئەم ( خۆشمان دەویست ) ە مەبەستی سەرەکی‌یەو سەر ئەنجامی بیری چیرۆك نووسە ، واتا خۆشەویستی‌یەکە تا ئێرەو تەواو ، ئەگەرچی کۆتایی چیرۆکەکە بەپرسیارێك دێت هۆمێدی ئەوەی لێ دەکات کە نۆمایەکی ڕەسە نی‌لێ چنگ بکەو یتەوە : ( تۆ بڵێی گوندەکە نۆمایەکی ڕەسەنی چنگ نەکەوێتەوە ؟ )، « ئەم رستەیە نووسەر لە کۆتایی چیرۆکەکەدا بە خەتی خۆی نووسیویەتی‌و لە چاپدا دەرنەچووە »

لەلایەکەوە خەڵکی گوندەگە بڕوایان وایە براوە بۆ ڕایسز ، لەم لایشەوە : ( منداڵەکان لەسەر توو لە ڕێگاکە لە دەوری کۆبوونەتەوە ، ئەسپەکە پەلی ڕاستی تا ئەژنۆی لە کونەکونێکدایەو ئەوی تری لەکاتی کەوتندا کەوتۆتە ژێر قورسایی لەشی ) . ئەم ڕاراییانە دژواری‌یەکی فیکری لای نووسەر دروست دەکات‌و نەی توانیوە هەڵوپستێکی ئاشکرا بەرانبەر ئەسپەکە هەڵبژێرێت ، وەك نەیشی توانیوە ئەو ڕاستی‌یەمان پێ‌بڵێت : ئایا لای خەڵکەکە گیانی ئەسپە کە وەك خۆی ماوەتەوە یان لەگەڵ گوم بوونی لەشیدا ئەویش ڕۆیشتوە ؟ ! لە چیرۆکی ـ هەیاس ـ دا جیهانی پڕ لە ئەندێشەو پاکی منداڵ دەبینین یاری کردن بە شووشەو ووردە بەردو خانووچکە دروست کردن ، سادەیی‌و خۆشەویستە ، وەرزی‌و پەشیمان بوونەوە ، زویری‌و ئاشتی ، دوان بە زمانی بینین‌و هیچ تر : ( لە ناو ئاوەکە گێڕدەبن ، کەهاتن ئەڵێم هەموومان پێمان شکاوە ) .

لە پەنجەکانیان وەك کرم دەجووڵێنەوە ، لە ووردە شووشە گوڵ دروست دەکەن ، دەیەها ووردە کونیش هەندێکیان خوارو خێچ ، هەندێك ڕێك ، بە تەنیشت یەکەوە، بەسەر یەکەوە، لەپاڵ گردەکەدا هەڵ کۆڵراوە ، چەند کون‌و پەرژینێك دروست ئەکەن ، یێکی دەدەنەوە « لە ئەستووری » پەنجەیان دیوار لە ووردە بەرد دروست دەگەن ، ڕووخانیانەوە ) ، نووسەر ئەیەوێت وێنەیەکی ڕاستەقینەی پەیوەندی‌و هەڵس‌وکەوتی منداڵێمان پیشان بدات ، لە دروست

کردنەوە تاپوورخاندن ، هەر بەو ــ عەفەویەتەی ــ کە لایەنی دەروونی ــمندالی پێدروست بووە ، بێ ئەوەی دەربەست بوون لە هەڵچوون و داچوونی و ڕووداوی ناو چیرۆکەکەدا کاری لەسەر منداڵەکان هەبێت ، ئەمە لایەنێکی گرنگە لە شارەزایی نووسەر بۆ جیهانی منداڵی و پتەوکردنی بنیاتی بەرهەمەکە ، ــ تجسید ــ کردنی هەڵویستەکان گیانێکی زیندوو پڕ لەبزۆتنەوەی داوەتە کارەکە ، هەست ئەکەیت خۆیشت منداڵ دەبیتەوەو دەست بە حەمامۆکێ کردن ئەکەیت ئەو ــ هەست کردنە ــ رەگەزێکی چاکی سەرکەوتنی چیرۆکەکە لە دنیای ــ تجرید ــ و ــ زهنیات ــ دووری دەخاتەوە .

سیفەتی باشی هەندێك چیرۆك نووسی ئەوەیە ، تا بەرهەمەکەیان ئەخوێنیتەوە واقیعەکەت بە زیندووی نایەتە بەردەست ، یان بابڵێین سەرنجیان ووردەو وێنەی جوان ئەگرنە دەست : ( قاچیان لە ناو ئاوە کە دا گیر دەبێت ) ئەم وێنەیە ژیانێکی گەورەی داوەتە چیروکەکە ، کێمان ئەو ــ گیربوونەی نەدیوە ! بەڵام گوێزانەوەی بۆ دنیای ئەدەب کارە مەزنەکەیە ، نەك گوێزانەوەیەکی میکانیکیش کە ئەمەیان ــ وەك گارۆدی ــ ئەڵیت : دژی واقیعیەتە . ئەگەر ئەم پرسیارانە بکەونە بەر تیشکی لێکدانەوەوە هەندێك ئیشاراتی رەمزیان لێ دەرناچێت ، دایکی ئاوات بۆ ئەگری ! قەرەباڵغی یە کە چی‌یە ! هەتاق بۆ رۆیشتووەو هاتنەوەو نەهاتنەوەی لە گوماندایە ؟ ( قەوانێکی ژەنگدار لەگەڵ هەندیک ووردە چەودا فڕێیە ناو کانێکەوە ) .
خۆ ئەگەر ئەمانە ئیشاراتی رەمزی نەبن ، ئەوا دێینەوە سەربا وەڕەکەی پێشوومان کە ــ ئەحمەدــ لەزۆربەی چیرۆکەکەکانیدا کۆمەڵێك پرسیاری بێ وەڵام ئەهێڵێتەوە کە خۆی ئاگای لێیان براوە ، لەم ڕووەوە ئەمەوێت ئەو ڕاستی‌یە دووبارە بکەمەوە کە من لەگەڵ ئەوەدا نیم چیرۆك نووس ئەندازیاربێت و بە سانتیم و ملیمەتر بلوێت ، چونکە ئەمەیان حەقیقەتی هونەرە نەك مێژوو ، بەڵام ئەمەیش نابێتە پاساوی کەلێنی گەورە کە نووسەر ئەوەی پێش چەند دێڕێك وتوویەتی نەچێتەوە سەری و وەك گرێکوێرە بۆ خوێندەواری بهێڵێتەوە ، چ لەناو هێنانی پاڵەوان یا لە کارێکا کەرەوتەنی ئاملۆەی بۆدەکات و پاشان ناچێتەوە سەریان .

لە چیرۆکی ــ تابلۆیەکی سوریالی ــ دا کۆمەڵەکەسێك لە وەرزێکی سارددا ، ئەیانەوێت لە شوێنێکەوە بە ئوتومبیل بۆجێگایەکی‌تر ، بچن سایەقەکە سەر خۆشە ، بۆیە ئوتومبیلەکە وەردەگەڕێت و ئەکەوێتە کوێرە شیوێکەوە، هەموویان وەك تابلۆی سوریالیان لێ دێت و خوێن بەسەرو چاوو لە شیاندا دادەچۆڕێت ، پاشان بۆ تیمارخانە دەگوێزرێنەوە ، بەڵام کەسی‌سێ یەم کە کارەساتەکە دەگێڕێتەوەو خۆشی لە ورگەڕاوەکانی ناو ئوتومبیلەکەیە ، لە ئەنجامی ئەو کارەساتەوە تووشی چورتمێکی گەورەبووە ، برینداری‌یەکەی لەوانی تر ناکات ، چارەسەریشی نی‌یە ، چونکە ئامێری پێویست لەو نەخۆشخانەیە دەست ناکەوێت ، برینداری‌یەکەی ئەم لەناو گەلیابەتی : ( بە ئەسپای لە قلوشەکە بەگەڵاوگەڵ ناو خوای لێ‌هێنا ، ناوگەلی بوبووە پەڕۆی بەردەست دۆمێکی شارەزا ) ، کەواتە کارەساتەکە قورسە ، چونکە لەگەڵ ئازاری لەشدا دەردێکی دەروونی گەورەیشی تووش هاتووە :
( بڕیارم‌داوە سواری ئەم جۆرە ئوتومبیلانە نابم ) .
پاڵەوانە سەرەکی‌یەکەیە ــ تداعی ــ لە نەخۆشخانەوە بۆ جەمسەری کارەساتەکە دەگەڕێتەوە ، بە هاوارو نالەی پیرە ژنەکەی بەرانبەری دایکی دێتەوە بیر ، کە نەی ئەو یست ئەم سەفەرە بکات و پێی ئەوت : ( ڕۆڵە مەڕۆ دەترسم ). وەك دایکی هەستی شەشەمی کەوتبێتە کارو لەو ڕۆوینەدا ڕێکەوتێکی ناخۆشی چاوەڕێ کردبێت ، کۆتایی چیرۆکەکەیش رۆمانسیانە یەبەیەك گەیشتنێکی بە سۆز دێت لە نیوان کوڕو دایکی‌دا : ( بیرت دەکەم دایە بیرت دەکەم ) .
لەم چیرۆکەدا ئەو شوێنەی ئوتومبیلەکەی بۆ دەچێت دیار نی‌یە ، لەبەر ئەوە ئەگەر نووسەر ویستبێتی بە دەرخستنی هەندێك لایەنی دەروونی خەڵکە کە لایەنی توێژو چینایەتیان نا دەربخات وا بۆ خوێندەوار ئەمە دەرناکەوێت .

هەندێکیان وا دەزانێ بۆ ڕێی هات و نەهات دەچێ ، هەیشە لای وایە بۆمزگەوت دەچێت ، هەیشیا ئەترسێ و خۆشی پێکەوە لە ڕوویاندا بەدی‌ئەکەیت ، بەڵام ئەمانە بۆ ! دیارە ئەگەر شوێنەکە ئاشکرا بوایە ئێمەیش ئەمانتوانی شوێنی چینایەتی و کۆمەڵایەتی ئەوا ئەدیاری بکەین .
بەلای منەوە ئەو هەموو بکرمو بەردەو دەرگەڕانو

دا گەڕانە تەنیا بۆ ـ لە پیاوەتی خستنی ئەو گەنجەیە ـ بەڵام لە پیاوەتی خستنەکەیش هیچی بە دوادا نایەت، ئەئە بیتە گرێ کوێرەیەك کە تۆوی سایکۆلۆجی لەگەڵ خۆیدا هەلبگرێت و پاڵەوانەکە لەو ـ هەست کردنەوە ـ بەدوای پڕکردنەوەی بۆشاییەکەیدا بگەڕێت ، هیچ نەبێت بەو مەبەستەی کە چیرۆکی کوردی کەمتر خۆی لەم لایەنەداوە ، ئەوسا کارەکە بەجێ ترو سەرکەوتوو تر ئەبوو ،کەچی لێرەدا لەباتی ئەو بارە دەروونی یە زیاتر تەخمین و ڕای پیرەژنەکەت لا دروست دەبێت کە بە کوڕەکەی دەووت : ( ڕۆڵە مەڕۆ ) .

لەم چیرۆکەیشدا ، نووسەر هونەرمەندانە کات و شوێنەکان دەگۆڕێت و زۆر بە ئاسانی لای خوێندەواریش گوێزانەوە کان دێتەدی ، بێجگە لەوەی کە لە بەکار هێنانی ـ تداعی ـ دا شارەزایانە و لە جێگای خۆیدا دەستیان بۆدەبات .

بۆیە لە تێگەیشتن و خوێندنەوەیدا هەست بەگرێ و گۆڵ و بێزاری ناکەیت . لە چیرۆکی ـ کەبێ دەنگی هێرش دەبا ـ دامرۆڤێکی بێ دەنگ و سەنگ وەك ئامرازی مەکینەیەك دێت و دەچێت ، بۆخەو حەب قووت ئەدات و پێشەی تەرێکی و خۆ خواردنەوەیە ، ئەم حاڵەتەی بە میراتی بۆ نەماوەتەوە و زگماکیش نی یە ، بەڵکو ئەنجامە پەرەسەندنی وەعی نووسەرە بە هەموودیاردەو نەریتە کۆمەڵایەتیەکان ، بەو واقیعەی خۆی و دەوروبەری تیایدان ، هەست بە ئاڵۆزی ژیانی مرۆڤی سەردەم ئەکات و کاری تێ ئەکەن : ( ماسی یەك ماسی یەکی تر هەڵدەلووشێ ) ئەوانەی دەیانەوێت ( لەسەر مێزی ویسکی .... ) ئەوانەی ( لەکوێ وە بابێ ... ) ، بێ دەنگی یەکەی لێ بووەتە خوو ، هیچ خوویەکیش ناتوانێت لە پەیوەندی یە کۆمەڵایەتیەکان و دەورو بەری مرۆڤ بترازێنێت ، خووکەیش خۆشەویست ئەبێت ، یان وەك دیاردەیەکی ـ سایکولوجی ـ ئەیەوێت تەشەنە بکات و تووشی هەمووکەسێك بێت : ( چی دەبوو گەر دەنگ نەبوایە ) . تەنانەت بێ دەنگی یەکە لە سروشتیشدا دەبینێت و لێ ی خۆشە : رووبارەکەی تەنیشتی مات و بێدەنگە ، گیازەردەهەلگەڕاوەکان لە جووڵە کەوتوونو لەناو بێ دەنگی دا ڕاوەن .

بەڵام ئەم خۆ خواردنەوەی زاتەوەرێنیاتی ژیانەی لەسەرەتاوە هەستی پێ دەکەیت ، زۆر نابات لەگەڵ هەڵچوون و داچوونەکانی دەروەدا جۆش ئەخوات و ئەبێتە هەڵوێست ، جیهانە دخراوەکەی ( خۆمم بە بچووك دێتە بەرچاو بە قەدەر خاڵێك کەمتر ) یان ( سفرەکەو نووکە دەرزی یەك ) فراوانی تێ دەکەوێت و جەمسەری پێدا گرتنەکەی پێدەست پێ دەکات : ( چەکی دەستم ووشەیە ، هەر ئەوەندە دەرگام بۆ کرایەوە بکەومە گفت بەئا ڕەزووی خۆم تۆڕی خۆم دەهاوم ) . ئەگەرچی لە ترسی گاشەیەك سەرەتا ( گوێ ئاخنین و زمان بەستنەوەیە ) کە ئەمەیش بۆ ماوەیەك تا ـ پێگەیشتنەکە ـ سروشتی یە ، تا بێدەنگی یەکە لە گەورەییدا ئەتەقێت و پاکۆی هێزی شەڕ ئەدات و سەرئەکەوێت ، بێدەنگی یەکیە ڕەشەبایەکی سەختی لەدوایە و یاساولەکان کەرەمزی ـ شەڕەکەن ـ لەبەلو پێ دەخات و نووسەر ڕاستەو خۆ ڕووداوەکان قوت ناکاتەوە تا لە خۆیانە وەپێ ئەگەن نایان خاتە ڕوو ، بێدەنگی یەکە کاتی دەبێتە ( هەڵوێست ) کە ئەبێتە پێشەی هەموو لایەك ، ئەمەیش لە خۆیدا ئاسایی ئەنجامی زۆرانباز یەکە ئەداتە دەست، ئەم شەڕە ئەزەلی یەی نێوان خێروشەڕ زۆر کاری درامی و ئەدەبی شاکاری دروست کردووە، هەمیشە بەسەر کەوتنی خێرەکە کۆتایی هاتووە ، ئەندازەی ڕاستگۆیی نووسەر لەگەڵ خۆی و خەڵکیدا پێوانەی گەورەیی بەرهەمەکەیەتی ، چونکە تەعبیرەلە سیفەت و تایبەتی یەکانی کەسانی ئەو سەردەمەو ئەو بارەی تیادروستبوون ، لێرەوە ئەدەبی ڕەسەن و ڕووکەش لێك جیا ئەبنەوە ، ئەدەبێك لێکدانەوەیەکی ڕاستەقینەی ناوەوەی مرۆڤ ئەندازەی خۆبەستنەوەی بەدەورو بەرەکەیەوە ، لەگەڵ ئەو ئەدەبەی بو ـ مودیل ـ ئەنووسرێت و تەنیا تویژاڵەکانی سەرەوەی تیادەردەکەوێت . ئەم چیرۆکە نموونەیەکی گەشی پێگەیشتنی بیری شۆڕشگێری و نەتەوەیی نووسەرو لێکدانەوەیەکی مەوزوعیانەی بارو سەردەمەکەیەتی.

# رێنجبەری د شعرێن ئەرزیدا

ملەتێ كورد بێگومان زۆر بویە ب كارو رێنجبەریێ یێ كری لەمی چاخو دەمێن مێژوویدا ، ئەگەر بێینو دویرۆكو شوینوارێن خو تێكڤەدەین . ئەڤ چەندە چاك د سترانو پەندێن كوردیدا روونو ئاشكەرا دبیت وەك د ڤێ پەندێدا دیار دبیت « شولكەرێ خو بە ، خوشتڤیێ خەلكێ بە » . كانێ چەند شول كار یێ پڕ نرخو بها بویە دناڤ ملەتێ كورددا ، چەند مروڤێ كورد یێ هاتیە پالدان بو كارو رینجبەریێ هەروەكو پەندەكا دی دیاروكەت « هەتا بەرێ دەستی رەش نەبیت ، تاما دەڤی خۆش نابیت » وەسا دیار دبیت كو مروڤێ كورد هەمی دەمان دڤیا شولبكەت چ چاران بێكار نەبیت ، بێهنەكا فرەهو خیرەتەكا زۆر هەبویە دەمێ هەر جهەك دیتبا دا هندەك مێوو باهیڤان لێ چینیت ، بەطەنو زویران ڤەوژێریتو مویشەكەت ، هندەك نیسكان ئان گەنمولكو كارسی بو قوتێ مالا خۆ پێوەركەت و هەر كەسەكێ زۆر شولكریا دا گەلەكێ خوشتڤی بیت لنك خەلكێ گوندێ خۆ ، بەرڤازێ ، ئەو مروڤێ چ كار بۆ مالا خۆ نەكربانا یێ نەدڤی بو لجەم هەر كەسەكێو هەزی زیارێ نەبو ، هەروەكو ئەڤ پەندە بوان مروڤان هاتیەگوتن «كەرموۆ ، خۆرموۆ نەكەرۆ دل كەسەرۆ».
پالدان بو كاری نەبەس دناڤ پەندێن كوردیدا هاتیە تومارکرن بەلێ هەروەسا هوزانڤانێن كورد مشە رێزكو مالك بێن ڤەهاندنو وێنێن رێنجبەریێ د ناڤ هوزانێن وان دا گەلەك دمشەنە و ، د ڤێ گوتارێدا ئەم دێ سێ وێنێن « ئەرزی » دەستنیشان كەینو دانینە بەر چاڤێن خوینەڤانێن هێژا :

وێنێ ئاشو هەڤران هێرانێ . بازانایە كو هەتا ڤان سالانێ ئاشێن ئاگری د ناڤ گوندێن مەدا گەلەك دكێمبون بەلێ لجهێ وان ئاشێن ئاڤێ هەبون ، ئەڤ ردنگێن ئاشان لوان جهان بون ئەوێن ئاڤەكا بۆش لێ هەبا دا شیابا ئاشی بگێریت ، ژبەر ڤێ چەندێ نەدویربو كو مرۆڤ ژ گوندێ خۆ چوبار دو سێ رۆژان لسەر ئاشی مابلو چەند رەنجو نەخوشی دیتبانا ، نانێ خۆ دگەل خۆ برباو جلێ دەوارێ خۆ بو ئێستنا خۆ كربا رازێرك و ئەگەر بێینو هوزانێن

عبدالكريم فندى يحيى

« ئەرزی » ڤەدەبنو ڤەکۆلین دێبینین کو ئەرزی هۆزانەکا ڤەماندی : بەحسێ خۆ تێدا دکەت دەمێ دچیتە سەر ئاشەکی دا هەڤرانێ خو پێربت بەلێ وەسا دیارە ئاشەڤان لدویڤ مەرەما دلێ «ئەرزی» هەڤرانێ وی نەمێرایەو ئەرزی وەك پسپۆرو شەمەرمزایەکی دربێ خۆ دڤەوەژێنیتە ئاشەڤانیو هوزانەکێ بێ درێسیتو دبێژیت :

هەی ئاشو ئاش هەی ئاشو ئاش
توبێ دگەڕهی بێو باش
تۆ هەڤرانا ئامێری باش
نە بەلگ هێلان نە قەلەم
هەی ئاشو ئاش هەی ئاشو ئاش

وێنێ دووێ جوتیارو رێنجبەرانە چاخێ کارو شولێ خۆدکەن جنیکو رەزا بسەروبەردکەنو ، دەمێ تێنە بەری ، تەرگ دباریتو هەمی دەرامەتێ وان دقۆلیتو پویچدکەت . (ئەرزی) هەروەکو رێنجبەرەکێ هنافو بجەرك لێ کوزری هەزانەکا قەشەنكو لێکهاتی بڤی کاری درێسیت ، ئەگەرا دلێ خۆتێدا دیاردکەت وەصفێن جوانو ژیهاتی تۆماردکەت ، کانێ چەوا عەورێن رەش تەرگ ژی دباریتو مێرزیڤە خو لبەرناکرن هندی تەرگەکا بوشو دژوارە هەمی رەزو جنیك قوتانو پویچکرنو دبێژیت :

نە بەلگ هێلان نە قەلەم
زنو شینبون زەڤی
بیستو پێنج رۆژێت تەمام
دناڤدا مابون کەڤی

پاشی ئەرزی وێنێ خۆ دروستدکەتو پێدا دچیتەخوارێو دبێژیت :

خفا باری ژ ئەسمانا
قوتان ئەمو هەمزانی
کرن ژ رزقێ خودانا
داقوتابو جهە هەمی

وێنێ خۆ هێژ بەرفرەهـ دکەتو داڤێن قەشەنگو ژیهاتی دهاڤێتە ناڤو دیاردکەت کانێ چەند تەرگەکا دژواربوو دەڤەر هەمی قوتاو دبێژیت :

دگەل برنجێت دهبا
ڤسلالکەتە کوندێ میر
کەر فرانەدن ژ بها
ئەخاسم هنارو هژیر

بەلێ بڤێ چەندێ بێهنا ئەرزی ناهێتو هێژ ئەگەرا دلێ خۆ ئەدارێتبە بدروسێ حالێ خو تێدا دیاردکەت کانێ چاوا لدور بیستانێ خۆ دزڤریتو بچاڤێ سەرێ خۆ دبینیت کو کارێ وی بێ چەند هەیڤان دبەر ئاڤێدا چو ، دەست ژ بێیان دریژبو لێهات و ، دبێژیت :

بەکرو بابو کورن
لدور بیستانا دزڤرن
توبێنن بەلگ ترترن
بکر تێنو ناکرن

چەندی ببێژن ئەرزی هوزانڤانێ کوچكو دیوانێن میرێن ئامێدیێ بو بەلێ پا دسەر هندێرا کارو رێنجبەری زبیرنەکرینە هەر بێ خۆ دیتی ئێك ژ تەخا رێنجبەر ، هەمی رەنگو کارێت رێنجبەرێ د ناڤ هۆزانو پەیڤێن خۆدا . یێن تۆمار وێنەکرین کاروان زبیرا ئەرزی نەچوینە چونکی ئەوی بخۆ دمەوارێ خۆ باردکرو دچو دەشتێ دا بو خێزانێ خۆ . هنارو مێوژان بکەنم بگوهوڕیت و دبێژن جارەکێ میرێ ئامێدیێ هاتە گوندێ «ئەرزێ» و فریکرە بدویڤ « بەکر بەگێ »ڕاو چاخێ هاتیە جەم میری بێشەبرزەو بێ سەروبەر ، میری گۆتێ : تە خێربیت ! ئەرزی هەر دەملدەست بەرسڤداو گۆت :

عاشقێ قەهوا شرینی
سەرخوشێ قەهوا تەحل
هنارکا دبەینە دەشتێ
سەربسەر ددەینە بدەخل

ئەرزی هوسا بێ رەوان بو ، پەهلەوانێ هەمیدستابو بەرسڤا هەر ئێکی دەملدەست لجەم هەبو .

# «قۆناغەکانی شیعری»

محمد امین احمد

بۆچوونە ناو جیهانی شیعری هەر شاعیرێکەوە ، پێویستە چەند مەسەلەیەکی وورد هەیە بزانرێ کە پەیوەندییان بە ژیانو هەڵسو کەوتی شاعیرو دەورو بەریەوە هەیەو رووناکییەکی تەواوی بخرێتە سەر بۆ زانینی ئەوزانیاریانەی کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان هەیە بەشاعیرو کۆمەڵو لایەنە سیاسیو ئابووری وکۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەکانیەوە .. ئەوەشیان بۆ دەستنیشانکردنی ئەو قۆناخانەی کە شیعرەکانی پێدا رۆیشتوون ، هەرچەندە ئەم کارەش سووکو ئاسان نیە ، چونکە لەوانەیە ئیستاکی ئەو ماوەیەمان نەبێ بەدوای زۆر لەو مەسەلانەدا بگەڕێین کە پەیوەندییان بە لێکۆلینەوەکەمانەوە هەبێ .. دووەمیان : ئێمە بە هۆی دیوانی ( تاریك وروون ) ەوە ، یا بە بەهۆی ئەو گۆڤارو رۆژنامانەوە دەتوانین شتێك لەو بارەیەوە دەست بێنین ، کە زیاتر شێوەی توێژینەوە دەگرێتە خۆیو تاکو بە هۆی ئەو شیکردنەوەوە دەگەینە ئەنجامی مەبەستەکەمان ، هەرچەندە زانینی ئەو لایانانە ، کە باسمانکرد ، مەرجێکی سەرەکییە بۆ ناسینی هونەرمەندی پایە بەرزو بلیمەت کە ئەو داهێنانە جوانانەی ، کە بە هۆیی پوختو سفتیکارە هونەریکەوەو هەڵویستی رۆژانەی خۆی ، خۆی لە ناو کۆمەڵدا دەچەسپێنێ . چونکە هونەرمەند ئەرکێکی کۆمەلایەتی بەجێدێنی و ئەمەشیان جێبەجێ نابێت ئەگەر ( خەڵك ) بەرەو پیری ئەو داهێنانەوە نەچێت .. وە لەبەر ئەم چەند هۆیانەی پێشوو ، ناچارین پەنا بەرینە بەر ( تاریك و روون ) ( ئەزموونەشیعرییەکانی ) هێمنو ( اعترافاتی ) شاعیر خۆی ، تاکو بتوانین قۆناخە شیعرییەکانی دەست نیشانبکەین . تاکو نەکەوینە ناو لێشاوی بەزەیی و ئەندێشەوە بەلکو بەشێوەیەکی زانیستیانە هەندێ لەو قۆناخانە دەستنیشانبکەین .

ئێمە دەزانین ، دەستپێکردنی هەر هونەرمەندێك بەچەند پلەو پایەدا رۆیشتووەو بەلکو چەند قۆناخی بڕیوە، تا گەیشتۆتە ئەو پایەیەی کە لە ئەنجامدا خۆیو هونەرەکەی تێدا دەگرێتەوە . وئێمە دەزانین هیچ هونەرمەندێك هەر لە خۆیەوە ، سەری هەڵنەداوە ، یا بەبێ بەهرەی هونەری پێ نیگەیشتووە ! ! بەلکو بەهرەی هونەری تێدا هەبووەو ئینجا کارتێکردنی خێزان وقوتابخانەو کۆمەڵو ڕووداوەکانی ژیان ، کاریان تێکردووە .

وبوونەتە هۆی ئەوە کە هونەرمەند بەدوای راستییا وون بووەکەدا بگەڕێ . لێرەدا ، تەنانەت زۆر جاریش وای لە هونەرمەند کردووە کە لەو بەری

(١) التفسير النفسي للادب ص٣٢

بەختەوەری‌و خۆشی ژیان‌دا بێنێتە خوارەوەو بە خەیاڵی‌دا نەیەت . بەڵکو بەنانێ جۆ ( قانع ) بێ ! هەر سووریش بووە وکۆڵی نەداوە و نەبەزیوە ، بە پێچەوانەی ئەو هونەرمەندە کە هەناسەی کورت‌و سوارەو ناتوانێ ڕێڕەوی ژیان بگۆڕێ‌و شتی تازە بێنێتەکایەوە . لێرەدا مەبەستمان بە بەراوردکردنی هونەرمەندی لاواز ، لەگەڵ هونەرمەندی ڕەسەن‌و هەلکەوتودا نیە ، بەلکو د مانەوێ قۆناخە شیعری‌یەکانی ، مامۆستا ( هێمن ) ی بلیمەت بە پێی ئەو بۆ چونانەمان دەستنیشان بکەین ــ لەبەر ئەوەی کە ئەم لێکۆلینەوەیە زۆری دەوێ ، زۆر شت ناخەینە ( رووەوە ــ دەتوانین ئەو قوناخە شیعری‌یانە کە مامۆستا ( هێمن ) ی بەهرەدار پێدارۆیشتووە بیکەین بە چەند بەشێکی سەرەکی .. هەرچەندە لە نێوان قوناخەکانیش‌دا سەرکەوتن‌و دابەزین ، ئومێدو نائومێدی ،دیار دەدەن واتە هەڵچوون‌وداچوونێك دروست دەکەن ، بەلام نابنە هۆی تێك‌دانی ئەو قوناخانە کە ئەوانەش بەستراوون بە بارە سیاسی‌و کۆمەلایەتیکەو هتد .. هەروا باری دەروونی فیکری فەلسەفی بیروباوڕ،ڕای هونەرمەندیش وهەلوێستی لەولا بمێنێتەوە .. جا لێرەدا بەپێی بۆ چوونی خۆم حەزدەکەم هەریەگە لەو قۆناخانە سیمان خۆی بدەمێ چونکە ناتوانین ژیانی شاعیرو بارە خێزانی‌یەکەی ، کۆمەلایەتی‌و ئابووری‌و سیاسیەکەو لەگەڵ پەروەردەی مندالی شاعیری‌و هەڵس‌و کەوتی لە ماڵ‌و لە قوتابخانەو لە ناو هاوەلانی‌دا جیا جیابکەینەوە، بۆیە بەپێی مێژووی شیعرەکانی ئەوقوناخانە بەم جۆرەی خوارەوە دابەش‌دەکەین :

**یەکەم قۆناخی لاوێتی :**

که لە پێگەیشتنی شاعیر ، وەکو شاعیرێك ناسراوێ دەستپێ دەکا . واتە لە سالانی ٩٣٩/١٩٤٠/٩٤١/١٩٤٢دا یەکەم شیعری ( خاوەنی‌ژێرە ) لە سالی ١٣٢٠/١٩٤١دا بەرهەمی نووسیوە ، لەو مێژووەوە تا دەگاتە سالی ( ٩٤٦/٩٤٧ ) دووەم لە سالی ( ١٩٤٧ )وە وەکو شاعیرێکی پێگەیشتوو قۆناخی شیعری لای وی دەستپێ‌دەکا . هەرچەندە لە هەرەتی لاوێتی‌دایە بەلام ئەو کارەساتە هەرەگەورە کاری‌گەرە ، کاری تێدەکا ، تاکو دەگاتە سالی ٩٥٣ کە شیعری ( ئاواڵی‌بەرز ) ی شاعیرمان لە لەدایك دەبێ‌و لەگەڵ شیعرەکانی ئەو سەردەمەی دا .

سێیەم لە سالی ١٩٥٣دا قۆناخی سێیەم دەستپێ دەکا کە شاعیری بەهرەدار تووشی نوشوستی‌و نائومێدی‌و تێکشان دەبێ‌و تادەگاتە سالی ( ١٩٥٩ ) کە شیعری ( چارەنووسی شاعیر ) و شیعرەکانی تری کە لەو بابەتەن لە دایك‌دەبن .

چوارەم قوناخی چوارەم لە سالی ( ٩٥٩ ) ددستپێ‌دەکا ، تا دەگاتە سالی ١٩٧٠ . وە لە نیوان ( ٩٥٩ ) و ( ٩٧٠ ) شیعری ( گەرمەشین ) و شیعرەکانی‌تری ، دێنە کایەوە .

قۆناخی پێنجەم لە سەرەتای سالی ( ١٩٧٠ )وە دەست پێ‌دەکا ... وە لە ئەنجامی ئەم دابەش‌کردنەدا چەندها لقو پوی لێ دەبێتەوە وە ئەوەشیان لە لاپەڕەکانی داهاتوودا باسیان دەکەین .

**« قۆناخی یەکەم » قوناخی لاوێتی :**

ئێمە دەزانین ( هێمن ) لە دایك‌بووەکانی سالی ( ١٩٢١ ) (٢) بەلام نازانین لە سالانی ١٩٣٣/١٩٣٩دا شیعری وتووە یانەء ؟ واتە لە تەمەنی (١٢) سالی‌دا یا لە تەمەنی ( ١٧/١٨ ) سالی‌دا شیعری هەبووە یا نەء ؟ ! .

بۆ وەلامی ئەم پرسیارە ، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ پێشەکی ( تاریك‌وروون )و (ئەزموونە) شیعری‌یەکەی، کە لە پێشەکیکەدا دەلێ : [ سالی ١٣١٧ کە لاوێکی (١٧) سال بووم ، مامۆستاکەم لە کۆلیجە ڕۆیشت ومنیش دەستم لە خوێندن هەلگرتو چوومەوە مالی‌و دەستم‌کرد بەکارو کاسبی ... بە رۆژکارم دەکرد بەشەو موتالا .. ](٣) ئینجا لەسەر باسەکەی دەرواو دەلێ [ سالی ١٣٢٠/١٩٤١م من لاوێکی پێگەیشتووبووم لە کارو باری‌کشت‌و کاڵ‌و ئاژەلداری کلرامە ببووم‌و لە ئەدەبیاتی فارسی‌و کوردیش‌دا ، شارەزایی تەواوم پەیداکردبوو بۆ خۆشم شیعرم دادەنا ](٤)هەروەها دەلێ [ لە شازدە حەڤدە سالی‌دا دەستم بە شیعر دانان‌کرد . چونکە زیاتر لە ژێر تەئسیری شیعری فارسی‌دا بووم . بە فارسی شیعرم دەگوت ](٥) وە [ لە تەمەنی بیست سالی‌یەوە بووم بەشاعیر . زیاتر هەستو عاتیفەی خۆمم دەخستنە نیو شیعرەوە ] (٦) .

بەلام وەکو خۆی دەلی کە ئەوشیعرانەی کە

(٢) تاریك وروون ل ٤

(٣) هەمان‌سەرچاوە ل ١٤

نووسیبووتی لە دوو توێی دەفتەرێکدا بوونو هەمووشیان سووتێنراون : [ ڕۆژێك خەریکی شیعر نووسینەوە بووم کارێکم هاتە پێشەوە دەرکەوتمو دەفتەرەکەم لە کوڕێ بەجێهێشت. ترسی وەم نەبوو بابم لەو وەختەدا بێتە دێوەخان زۆرم پێنەچوو کە هاتمەوە دەفتەرە سوور دیار نەبوو پرسیارم‌کرد .

(٤) تاریك و روون ل ١٥

(٥) ئەزموونی شیعرم (دەستنووس )

(٦) هەمان سەر چاوە

گوتیان : بابت دەستی دایەو بردی ! لە پشتێن بەرمو ژێرم مرد . پێم‌وا نەبوو بە هاسانی نجاتم‌بێ . زانیم خراپم لێ قەوماوە . شیعرەکانم پوختە نەبوون ، لاسایی شاعیرە کۆنەکانم کردبۆوە ، هەموو جۆرە شیعرێکم دانابوو ، تەنانەت لە فێر هاویشتن‌دا لاسایی شیخ‌ڕەزاو ئێرەج میرزای فارسیشم کرد بووە . بۆیە هەقم‌بوو بترسم . من هەم شاعیر بووم‌و هەم ئیعترافم بەگوناه کردبوو . با بەخەیالیش‌بێ .منیش وەك شێخ رەزا بوختانم بۆ خۆم کردبووو بابم شتی وای پێ قەبووڵ نەدەکرا . بەڵام وا دیاربوو نەی‌خوێند بوونەوە ] (٧) .

لەم ووتو وێژەی مامۆستا ( هێمن ) وە لەم دان پێدانانەی شاعیر خۆی ، زۆرشتمان دەدا بەدەستەوە یەکێك لەوانە کە مەبەستمانە ئەوەمان بۆ جەخت دەکا کە دەفتری شیعری ـ وەکو لاوێکی پێگەیشتوو ـ هەبووە وهەموو جۆرە شیعرێکی وتووە .

(٧) تارێك و روون ل ١٥

ودلەو پێشەکێکەدا بۆمان دەردەکەوی ، کە لە ساڵی ( ١٩٤١ ) دا لاوێکی پێگەیشتوو بووە ، [ لە ئەدەبیاتی فارسی‌و کوردیش‌دا شارەزایی تەواوم پەیداکردبوو. بۆ خۆشم شیعرم دادەنا . دیوانێکی گەورەم دروست‌کردبوو . بابم ئەگەر چی بۆ خۆی ئەهلی زەوق‌بوو شیعری زۆر پێخۆش‌بوو .. زۆری پێ ناخۆش‌بوو من ببم بەشاعیر . لە کن ئەو ببڕای ببڕای باسی شاعیری خۆم نەکردووە . دەفتەری شیعرەکانم وەك بێچوە پشیلە لە بابم دەشاردەوە ](٨)

لێرەدا دژوارێك دروستدەبێ . چونکە لە ( ئەزموونی شیعریم ) دا ئەوەی وتووە کە هیچ بەخەیالی‌دا نەهاتووە ببێ بە شاعیر یان ئەدیب یانووسەر بەڵکو حەزی کردووە ببێ بە ئەفسەرو دکتور ، کەچی لەم پێشەکی دیوانەکەی‌دا دەبینین شاعیرمان هەر لە منداڵی‌یەوە حەزی لە شیعرو ئەدەبیات کردووە ، بەڵکو لە شازدەو حەڤدەساڵی‌دا شیعری وتووە ، لە تەمەنی‌بیست ساڵی‌دا بە تەواوی شاعیریەتی ( هێمن ) ئەشونومای‌کردووە .

(٨ )تاریك و روون ل ١٥

ولەو ساڵانەدا ، واتە لە دەورو بەری گۆڤاری گەلاوێژدا یەکەم شیعری بۆ بلاوکراوەتەوە ، کە دەڵێ : یەکەم شیعرم لە گۆڤاری گەلاوێژدا بە ناوێکی موستەعار بڵاو بۆوە . شیعرێکی سیاسی ڕێك‌و پێك‌و رەوانە . ئەو دەمی زۆرم شایی بەخۆم بوو کە شیعرم لە گۆڤاری‌دا چاپ‌دەکرێ . کە چی ئێستا خۆم لێ بێ ساحیب کردووەو نامەوێ کەس بزانێ ئەو شیعرە ئی‌منە ](٩) هەروەها دەڵێ : [ دووەم شیعرم لە ژمارەی (٢)ی گۆڤاری ( نیشتمان )دا نزیکەی (٣٣) ساڵ پێش چاپ‌کراوەوە لە لاپەڕەی (٥٢)ی‌تاریك‌و روون‌دا دووبارە چاپ‌کراوەتەوە](١٢). ئەم شیعرەکە باسی دەکاو لە دیوانەکەی‌دایە ( دەیلێم و بێ باکم ) ە مێژووی لەسەر نی‌یە ! بەپێی ئەم قسەیەی شاعیری بەناوبانگ کە پێش (٣٣) ساڵ بلاو بوویێتەوە ئەوا دەگەڕێتەوە ساڵی ( ١٩٤٥ ) زاینی ئەگەر شاعیرمەبەستی لەو (٣٣) ساڵە بەپێی ساڵی زاینی‌بێت .

(٩) ئەزموونی شیعریم / دەستنووس

(١٠) هەمان سەرچاوە .

وە ئەگەر مەبەستی لەساڵی کوردیش‌بێ ئەوا دەکاتە ( ٤ ، ١٣ ) هەمان‌شت دەگرێتەوە . کەچی شیعری واشی لە دیوانەکەیدا هەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ( ١٩٤١م ) زاینی . بەناوی (خاوەنی‌زێڕ)ەوە، تۆمارکراوە . واتە سەرەتای شیعری ( هێمن ) پێش ( ١٩٤١ ) دەست‌پێ‌دەکا بەڵام وەکو شاعیرێکی پێگەیشتوو بڕوای بە خۆی کردبێ لەساڵی(١٩٤١)دا بەدی دەکرێ‌و شوێن پەنجەی خۆی لە جیهانی‌شیعردا کردۆتەوە . ئەمەشیان بە قوناخی شیعری لاوێتی شاعیر دادەنرێ ، هەرچەندە لەو دەست نووسەی کە باوکی سووتاندۆیەتی هیچ شیعریکمان بەرچنگ نەکەوتووە ، بەڵام لە ئەنجامی گەڵاله کردنی مێژووی شیعرەکانی ( من دەیلێم وبێ باکم ) لە گەڵ شیعری ( خاوەن زێر) ساکاری‌یان پێوە دیارە بەڵکو شیعری موناسەبەتە . شیعرێکی دروشمی‌یە هەر وەکو خۆی دەڵێ (ئەو دەمی زۆرم پەرۆش بوو بەڵام پاشان

گوتم دەستی خۆش‌بێ چونکە بێ‌گومان ئێستا مابان بۆخۆم دەم‌سووتاندن . راستە هـــەموو مەووزوون بوون‌و قافی‌یەیان هەبوو . بەڵام لاسایی کردنەوەی تەواو بوون ، هەستی شاعیرانەی خۆمیان تیادا بوو ، پاشانیش زۆری وام فڕی‌داون ) (١١) .

واتە وەکو هەموو (نووسەرێك) یا (شاعیرێك) ی تازە پێگەیشتوو دەستی دابێتە نووسین‌و شیعر دەبێ بەو قۆناخەدا تێپە بووبێ . لە قسەکانی (هێمن)ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە پێش تەمەنـــی بیست‌ســـالیش شیعری وتووە . کە بریتی بوون لە کێش‌و قافی‌یـــەو [ ئیستامابان بۆ خۆم دەم‌سووتانـــدن ] ئەوەشیان راستی‌یەکە ناشاردرێتەوە . چونکە پلەی پێگەیشتنی ( هێمن ) لە قۆناخی ئێستای‌دا دەیان وەکو ئـــەو شیعرەمەوزوون موقە فغایە دەپێچێتەوە . بۆیە لـــە ڕوانگەی ئێستایدا دەروانێتە ئەو سەردەمـــە .. وە ئەم پێشەکی‌یەشـــی لـــە ســـالی ٣-١١-١٩٥٢دا نووسیوەتەوە . بەڵام سەرکەوتنی شاعیرو قۆناخـــە شیعری‌یەکانی جگە لەو سەرەتای‌یەی کە سووتاون‌و فەوتاون ، دەتوانین بەم جۆرەدا بەشی بکەین کە لە

(١١) تاریك وروون ل ١٥

پێشەوە باسمان کرد . بەڵام دەبێ ئەم پرسیارەش بکەین :

ئەگەر مامۆستا هێمن وەکو خۆی دەڵێ ئـــەو شیعرانەی کە بێ کەڵك بوون‌و لە ئەنجام‌دا حەزی لە سووتاندیان کردبێ‌و زۆری واشی فڕی‌دابـــێ ئەدی چۆن لە سالی ١٩٤١ دا شیعری ( خاوەنی زێر ) ی داناوە ؟ یا ماوەتەوەو نەفەوتاوە؟ گریمان ئەم شیعرەیی لە ناو دەفتەرەکەی‌دا بووبێ ؟ ! هەرچەندە ئەم پارچە شیعرەی جوانەو پڕمانایە بەڵام سەرەتایی پێومدیارە لـــە کاتێکدا بمانەوێ بـــەرا وردێکی کورت لە نێوان ( خاوەنی زێر ) و شیعرێکی ئەو سەردەمەی بکەین ! لە لایەکی ترەوە ئەو شیعرەی لە بیست ســـالی‌دا ( ١٩٤١ ) دایناوە کە دەڵی :

**لە بـــارو قیتو قۆزە خاوەنی زێـــر**
**ئەگەر کووڕە وەگەر گۆجەو شەل‌و گێـــر**
**بـــەژن باریـــك‌و شـــوخ‌وشـــۆرە لاوە**
**ئەگەر پیرێکی خوێن تالـــەو ورگ تێر**
**دەڵێن زاناو ئـــەدیبو خوێنـــدەوارە**
**ئەگەر نەیخوێندبێ شەش پیت و دوو دێر**
**بەڵام زێڕت نەبێ ســـووکی ئەگەر تـــۆ**
**بدەی دەرسی هـــەزاری وەك شەکسپیر**

ئەگەر چی ئەم پارچە شـــیعرە پەردە لەســـەر کۆمەڵی بۆرژواو دەرەبەگ‌و خاوەن پول‌و پارەو سامان هەڵدەداتەوە ، بەشێوەیـــەکی هێمنانە توانـــج‌و پەلار یان تێ‌دەگرێ کە پارە لای وان هەموو شـــتێکە ئیتر زانســـت‌و ســـەقافەتی چی ؟

هەر لەدان پێدانانەکەی (هێمن) وا بۆی دەچم کە باوکی حەزی نەکردووە یا نەیوویـــستووە ( هێمن )ی کوڕی ببێ بەشاعیر ، بەڵکو نەیشی ویستووە ببێ بـــە دکتور یان ئەفسەر بەڵکو ویستوویەتی ببێ بەزانایەکی گەورە ، خزمەتی ئایین‌و شەریعەتی ئیسلام بکا – وەکو خۆی دەڵێ – وجێگای باوکی بگرێتەوە .. هەر وەکو بیروباوەڕی هەموو پیاوە گەورەکانی ئـــەو ســـەردەمانە حەزیان لە شیعری گوناە کردن‌و جوێن فرۆشتن نەکردووە ، چونکە لە قورئان‌دا باسی ئەوەی کردووە کە [ والشعراء يتبعهم الغاوون الم تر انهم في كل واد يهيمون ، يقولون مالا يفعلون ، الا اللذين آمنوا وعملوا الصالحات ] واتە بە پێی ئەم ئایەتەو بەهۆی سۆفی‌گەرێتی بنەماڵەی هێمن،باوکی حەزی‌نەکردووە کوڕەکەی ببێ بەشاعیر [ بۆیە هەقم بوو بترسم . من هەم شاعیر بووم‌و هەم ئیعترافم بە گوناە کردبوو بـــا بەخەیالیش بێ . منیش وەك شێخ‌ڕەزا بوختانم بۆ خۆم کردبوو وبایشـــم شـــتی وای پێ قـــەبوول نەدەکـــرا ](١٢) لەم قـــەبـــەی دیارو ئاشکرابـــە ویستوویەتی ڕێبازی شێخ‌ڕەزا ڕەچاوبکا ! یا لەبەر ئەوە بووە کە شیعرەکانی توونداو تیژ بوون ، بەتایبەتی بەگژا چوونی شێخ‌و سۆفی‌و کۆلکە مەلاو خانەقادا ، بۆیە باوکی نەیویـــستووە ئەو نهێنی یانە بدرکێنێ‌و لە بنەماڵەکەیـــان هەڵبگەرێتەوە ، ئـــەم ڕووداوەش ڕووداوێکی مێژوویم دەخاتەوە یاد کە باوکی شاعیری بەناوبانگ (الفرزدق) ی شاعیری عەرەب، نەیویـــستووە کوڕەکەی ببێ بە شاعیرو ناچار شکایەتی لای ئیمـــام ( علی ) کردووە ، ئەویش داوای لێ دەکا کە ڕوو بکاتە قورئان‌و شەریعەت .

ئەو هۆیانە هەموو شایانی باس‌و لێکۆڵینەوەن‌و. هەرچۆی بووبێ. ئەم جۆرە شیعرانەی مامۆستا هێمن بە سەرەتای قۆناخی یەکەمی دادەنرێن کە زیاتر بـــە شێوەی کلاسیکی‌یەکی خەســـتو خـــۆل شیعری

(١٢) تاریك وروون ل ١٥

نووسیوە بە تایبەتی شیعری ( خاوەن زێر ) و ( دە یلێم‌و بێ باکم ) .. وە نەبێ شیعرەکانی لەم قەوارەیە دەرچووبن بەڵکو گۆڕانێکی هەرە گەورەیان تیادایە ئەم باسەش دەهێلینەوە بۆ دەرفەتێکی تر چونکە ئینتماکردنی بە کۆمەڵەوە ، دەست هەڵگرتنی لە یار وشەو داوەت ، جوانترین‌و بەرزترین شیعری داهێناوە کە هەتا هەتایە لەگەڵ مێژووی نەتەوایەتیمان‌دا دەزرنگێتەوە ( گەرچی تووشی رەنجە ڕۆیی و حەسرەت‌و دەردم ئەمن ) . من‌وا بە باشی دەزانم کە ئەم شیعرەی ( بکرێ بە قۆناخی یەکەمی ، کە لە ساڵی ( ١٩٤٢ ) دادایناوە . وەکو لاوێکی خوێن گەرم بیر دەکاتەوە و لە قوناخی هەرزەکاری بەجی دەهێلی وەکو لە سایکۆلۆژیادا باس کراوە . دەبا ئەوەشمان لە بیر نەچێتەوە کە مەبەستمان لە قۆناخی یەکەم تەنیا ئەوە نیە کە شاعیری پایە بەرز لە بەر ئەوە کە لاوێکی زیرەك‌و کاسبو ووریا بووە بۆیە ناومان ناوە قۆناخی یەکەم . نەخێر . بەڵکو مەبەستمان شیعرەکانی‌یەتی ، وە هەر وەکو ووتمان : ئەم قۆناخەش لە ساڵانی ١٩٤١/٩٤٢/٩٤٧ هەر بە قۆناخی یەکەم دادەنرێن . وەلەم قۆناخەدا زیاتر ( ریالزم ) یانە بیر دەکاتەوە ، تا وردە وردە

بەرەو ڕۆخی خەم‌و خەفەت‌و دەردو مەینەت ، نومێدو نائومێدی سۆزو سکاڵا هەنگاو دەنێ وە ئاشکرا لە هەندێ شیعرەکانی ساڵی ١٩٥٣ دا دیاردەکەوی. هەر وەکوو شاعیر خۆی لە ( ئەزموونی شیعرم ) و ( پێشەکی دیوانەکەی‌دا : لە کوێ‌و بۆ کوێ ) دا باسی کردووە کە لە دوای ساڵی (١٩٤٧) تووشی ئەو حەسرەت‌و نامۆیيە بووە . هەر چەندە کاکە ( ئاوارە ) لە ( بیری نوێ ) دا قوناخی لاوێتی شاعیری لە ساڵی ( ١٩٤٥ ) دەستنیشان کردووە کە دەڵێ [ شاعیر لە هەرەت‌و تانی لاوێتی‌دا بەشداری لە چالاکی سیاسی کردووە ، بەتایبەتی لەسەردەمی ( کۆمەڵە .. ) و بەرەودوا وە بە شیعری شیرین‌و ناسکی نیشتمانی‌و کۆمەلایەتی هانی گەشەسەندنی هەستی نەتەوایەتی کۆمەڵانی خەڵکی داوە . کە شاعیر لەهەستی مرۆڤ پەرستی‌دا ئەتوێتەوە هەموو ئازارو ئەشکەنجەی ئەوان لە ئاوێنەی گیان‌و بیری ئەم‌دا تیشك ئەداتەوە ] (١٣)

ئێنجا دەڵێ [ بەم چەشنە شاعیر تا ساڵی ١٩٤٥ کە سەرەتای شاعیرێتی بووە

(١٣) بیری نوێ ژ ١٦٩/٦-١٢-٩٧٥

ئاوێنەیەکی سەردەمی ڕاپەڕینی خۆیەتی‌و هەمو ئازارو ئەشکەنجەو مەینەتی لە بیرو باوەڕی دا تیشك ئەدەنەوە . شاعیر مرۆڤێکی هەست زیندوو ، ئازادیخواز ، مرۆڤ پەروەر، نیشتمان پەرستە ) (١٤)

بەپێی بۆچوونمان کە لە پێشەوە باسمان کرد ، سەرەتای شاعیری یەتی هێمن لە ساڵی ١٩٤٢/١٩٤١ دەست پێ‌دەکا . چ بە لەو باسکردنەی کە لە پێشەکیکەی‌دا باسی کردووەو چ لە شیعری ( خاوەن زێر ) چ لە شیعری ( کوردم ئەمن ) دا کە ئەم شیعرە بەهێزترین شیعری مامۆستا هێمن دادەنرێ کە لە ساڵی ١٩٤٢ داوتوویەتی. بەلام ساڵانی ١٩٤٥ ١٩٤٦/١٩٤٧دا دەتوانین بڵێین هێمن توانیویەتی شیعرەکانی خەستر بکاتەوە ، وێنەی واقعی زیاتر بە خۆیەوە بگرێت ، و زیاتر لە کەم‌و کوڕی‌و نەخۆشی‌یەکانی گەل‌و نیشتمان‌و مرۆڤی کورد نزیك بێتەوە . هەر وەکو لە شیعری [ خاودن زێر ١٩٤١ کوردم ئەمن ساڵی ١٩٤٢ ، وتوو وێژی کچم و کوڕ ١٩٤٢ ، دەیلێم وبێ باکم قەڵای نیشتمان ئەمەگی گولان ساڵی ١٩٤٣ بەهاری لادی ١٩٤٣ تۆم هەر لەبیرە ١٩٤٤ کیژی لادی ١٩٤٥ بژی دیمکرات ١٩٤٥ ڕۆژی خۆشە ١٩٤٥ هەتاوی ئیقبال ، مێژووی

(١٤) بیری نوێ ژ ١٦٩ ٦-١٢-٩٧٥

( لەسەر نیە ) ڕێبەندان‌و ٭اعیر ١٩٤٦ نەوروزی رزگاری ٩٤٦ ١ پێکەنینی گو ١٩٤٦ بلوێری شوان ١٩٤٦ کورد و ئازربیجان ١٩٤٦ ] تا دەگاتە ( ڕۆژگاری ڕەش کە لە ساڵی ١٣٢٦/١٩٤٧دا وتوویەتی . کە دەبێتە قۆناخێکی تایبەتی‌و سەرەکی لەقۆناخە شیعری‌یەکانی ( هێمن ) ، هەرچاندە هێمن خۆی لە هەرەتی لاوێتی دایە ، بەلام شیعری قوناخی دووەمی لە شیعری شاعیرێکی پیری خاوەن ئەزموون‌و دنیا دیدەو قاڵ بوو خۆی دەنوێنێ .

## قۆناخی دووەم

ئەم قۆناخەش لە ساڵی ١٩٤٧دا وەکو شاعیرێکی پێ‌گەیشتوو ی قاڵ بووی ناو روداو کارەسات دەستپێ‌دەکا . تا دەگاتە ساڵی ١٩٥٣ کە شیعری ( ئاواتی بەرز ) ی شاعیرمان لە دایك دەبێ ، هێمن خوی دەڵێ [ هەر چەندە لە شیعرەکانی پێشووشم‌دا سۆزی شاعیرانەو خەمناکانە تا رادەیەك

بەدی دەکرێ . بەڵام ئەو سۆزە لەپاش ساڵی ١٩٤٧دا کە توندترین زەبرم لێ دراو گەورەترین موسیبەتـم بەسەرهات . لەتیفترو گەرمترو شاعیرانە تر کەوتە نێو شیعرمەوە لە ( بابر دەڵە ) دا کە ئەو ساڵ لـە ولاتی غەریبایەتـیدا گوتوومـە وا لـەگـەڵ بولبول دەدوێم ] (١٥) .

(١٥) ئەزموونی شیعرم دەسنووس .

لەو قسـەیەی مامۆستا هێمن بۆمان دەردەکەوی کـە ئەم شیعرەشی لە ساڵی ١٩٤٧دا داناوە ، کە ئەو خەمناکییەش باسی کردووە لە ( ئاواتی بە رزدا ) کە ساڵی ١٩٥٣/١٣٣٢ دا ووتراوە . گەڕانەوەیەکـی هەرە بەهێزی تێدایە ، بەڵکو بەرەو قۆناخی لاوێتی دەکشێ واتە هەر لە شیعری لاوێتی ( هێمن ) دا دەنرێ چونکە بەهەمان هێزو تواناو سۆزو عاتیفەدە دەڵێ :

**دەستیدا دەستی برای و هاتە ناو کۆڕی خەبات(١٦)**
**کیژی نەشمیلو لەبارو شۆخو گوێ بە گواری کورد .**

واتە لەم سـاڵەوە ، بە هۆی ئەو کارەسـاتەوە کارێکی هەر گەورە دەکاتە سـەر شاعیری پایەدار، وای لێ دەکا کە بەرەو قۆناخی نوشووستیو نا ئومێدی هەنگاوبنێت . کە هەرچەندە لەم قوناخەشدا بەتێکرا لە ریالیزمی لای نەداوە بەڵام لەناو ئاهـو هەناسەی گەرمو حەسرەتدا زیاتر ئولفەت دەگرێ . ئەو لاوە بێباکە ، پڕ لەرقی پیرۆز کە دەڵێ :

**منـم لاوێکی بـێ پـەروا**
**لە کـەس باکـم نیە بەخـوا**
**ئەگەر ئاغـا لـە حەپسم کـا**
**ئـەمن دەیلێـمو بێ باکـم**

(١٦) تاریكو روون ل ١٢٥/١٢٦

(١٧) تاریك و روون .

که دەبینین چۆن لە پاشان وا پەنا دەباتە بـەر سۆزو گریانو ئاهو ناڵەی بێدارای شەو ! هێمن ، وەکو دەڵێ : [ لە پاش ساڵی ١٩٤٧ دا کە توندترین زەبرم لێ دراو گەورەترین موسیبەتم بە سەرهات ] چونکە شاعیر [ لە کاتێکدا سەر گەرمی بادەی سەرکەوتنەو دڵشادی باخی ئاواتو ئامانجی بەرگرتوویەتی ، روو بەرووی کارەساتێکی گـەورەی جـەرگ بـڕ ئەبێت ... ] (١٨)

ئەم بەڵگەیەو چەند بەڵگەیەکی تریش کە لـە کاتی خـۆیدا باسیان لێوە دەکەین ئەوەمـان بێ رادەگەیێنێ کە بەرچی ڕایەکەی دکتـور قاسـملو دەداتەوە کە دەڵێ هێمن نەیتوانیوە هاندەری ڕێڕەوی ژیان بێت بۆیە پەنای بردۆتە بەر ئەندیشەو تاکو لە واقیعە تاڵە کە ڕابکاو خۆی رزگار بکا .

بەلای منەوە جگە لەو زەبرو توندییەی ژیانو موسیبەتە کە تووشی شاعیر بووە هۆی کەش هەیە بۆ هاندانی شـاعیر بەرەو سـۆزو ئەندیشـە و نامۆیو نائومێدی کە ئەوەشیان ماکی پەروەردەی منداڵـیو نەرێتی ماڵەوەیانو حوجرەو و تـەکیەو سۆفـیو

(١٨) بیری نوێ ژ ١٦٩ ٦-١٢-٩٧٥

باوکیو خێزانەکەیانە ! بۆیە دەبینین وورده وورده دەکەوێتـە گومانەوە ، پەنا دەباتـە بەر سـۆز و رومانـسیەت چونکە [ کاتی شادێکەی بە ئاگر خـەم دا ئـەبلۆخی ، ژانی ئازارە بـە سوێکان نێـرك ئەکەن ، لە ناخی دەریای سـۆزو هـەستەوە ، مێسکی بێ پایان سەر ئەکا ، لە قوڵبی هەر هەنسکێکا ئاخو ئۆفێك جوانە مەرگ ئەبێ ، جا شاعیرێکی هەست ناسکی وەك هێمن زۆر جار لە گۆشـەیی تەنیایدا سکاڵایەکی تەزیوو دنیای دەروونـی ئەشلـەقێنێو هەناسـەیەکی سارد بە دەم تاسەیەکی نەرمو گەرمەوە بە با ئەدا !

**بەڵـێ گریانـی نیوەی شـەو**
**دەکـا ئاسۆری دڵ مەرهـەم**
**کـوڵو کـۆم دا دەمرکێنـی و**
**بەجێ دیلێ دلـی من خـەم ] (١٩)**

شاعیر پایەدار هەست بە تەنیایی دەکا . تەنیا هاوڕێیەکی ، هەیـە ، ئەویش خەمەوەکـو لـە ( شیعری سکاڵاکەیدا باسمان کرد ) . وە ئەم سۆزەش لە شیعرەکانی ( رۆژگاری ڕەش ١٩٤٧ کچی مەهاباد ١٩٤٧ بابر دەڵە ١٩٤٧ فرمێسکی گەش ١٩٤٨ گریانی

(١٩) بیری نوێ ١٦٩ ٦-١٢-٩٧٥

نیوە شەو ٩٤٨ گۆمی خوێن ١٩٥٣ ] دا بەدی دەکرێن هەر چەنـدە لـە سـاڵانی ١٣٢٩ ، ١٩٥٠ ١٣٣٠ ، ١٩٥١ ١٣٣١ ، ١٩٥٢ ١٣٣٤ - (١٩٥٥/١٣٣٤ ) و ساڵی ( ١٩٥٦/١٣٣٥ ) و ( ٩٥٨/١٣٣٧ ) دا شیعری ئەو تۆمان بەرچاو ناکەوێت ؟ ! بەڵام ئەم هەڵسو کەوتەی ، ئومێدو نائومێدی لەساڵی ١٩٥٩ دا زیاتر سەر هەڵدەدا وەکو شاعیر خۆی باسـی کردووە ، دەڵێ :

١ ـ [ ( سالی ١٣٣٨ سالێکی زۆر شووم بوو لە مێژووی ژیانی من دا ) جگە لەوە هۆیەکی تری هەرە گەورەتر کاری کردۆتە سەر شاعیر ئەوەیە کە خۆی دەڵێ :

٢ ـ ( منیش لەو سەردەمەدا تووشی نەخۆشییەکی رووحی هاتم . ناهومێدییەکی رەش ئاسۆی ژیانو بیرکردنەوەی داگرتم ] (٢٠) .

دوور نیە ـ وەکو لە پێشەوە باسمان کرد ـ خالی دووەم ، لەگەڵ خالی یەکەم دا پەیوەندیەکی هەرە بەهێزیان لەگەڵ یەکدا هەبوو بێ !! کە دەبێتە پردێك بۆ قۆناخی سێیەمی شیعری هێمن .

(٢٠) تاریك و روون ل ٤٢

## قوناخی سێیەم

لە سالی ( ١٩٥٣ ) وە دەستپێدەکا تا دەگاتە سال ( ١٩٥٩ ) لە دوای ئەو سالەشەوە تا دەگاتە شەستەکان کە شیعری (بۆسەی رۆژگاری لە ١٣٣٨)دا وتووە.چارە نووسی شاعیر لە سالی ١٩٥٩/٣٣٨ داو ( ماچی شیرین ) لە سالی ١٣٣٨ ٩٥٩ دا ) وتووە . کە لە ( گلێنەی شاعیردا ) بە تەواوی دیارو ئاشکرا رەنگ دەداتەوە کە لە سالی ١٩٦١دا ئەم شیعرە دەڵێ : ئەگەر خەرمانی عومرم ئێستەکانە پاکی بابی با
بە مەرگی تۆ مچوڕکیشم بە دڵدا نایە بابی‌با !

## قۆناخی چوارەم

لە ( ئاسۆری تەشەنە ) دا لەژیانی واقیعی رادەکاو بەرەو رۆمانسیەتێکی پڕ لە ئەندیشە هەنگاو دەنێ ، شیعرەکانی لەم قۆناخەدا زیاتر خەستر دەبێتەوە کەلەسال ( ١٩٦٠ ) دەستپێدەکا تا دەگاتە ( ١٩٧٠ ) ...

## قۆناخی پێنجەم

لە سالی هەفتاوە دەستپێدەکا تادەگاتە شیعری( عشقو ئازادی ) و ( جوانی بەس نیە ) و ( چاوێلکە ) و ( چەژنە پیرۆزە ، کە لە پاشکۆی رۆژنامەی عیراقدا بلاوکراوەتەوە هتد .

هەرقوناخێك لەم قۆناخانە کە باسمان کرد سیماو رۆخساری تایبەتی خۆی هەیە .

با ئەوەشمان لە بیر نەچێت کە لە نیوان سالی ١٩٤١ تا سالی ١٩٧٨ ، شاعیری پایەدار شیعری وتووە کەچی مێژووی دانانی لەسەر نیە ، یا سالی واش هەیە ( لە ئەنجامی بەراورد کردنی مێژووی شیعرەکانییەوە ) شیعری نەوتووە ، لەوانەیە وتوویێتیو بلاونەبوویێتەوە . بۆیە دەبینین زنجیرەی سالنامەی شیعرەکانی پچڕ پچڕ دێنە بەرچاو بۆ نموونەش :

شیعری ( دەیلێم و بێباکم ) ، ( قەلای نیشتمان ) ، ( هەتاوی ئیقبال ) مێژوی دانانیان لەسەر نیە . هەروەها شێعری ( موونایستینم ) .

وە لە سالی ( ١٩٥٠/١٣٢٩ ) ( ١٩٥١/١٣٣٠ ) ( ١٩٥٢/١٣٣١ ) ( ١٩٥٦/١٣٣٥ ) ( ٩٥٨/١٣٣٧ ) ( ١٩٦٤/١٣٤٣ ) ( ٩٦٥/١٣٤٤ ) ( ٩٧٥/١٣٥٤ ) لەم سالانەدا شیعری ( هێمن ) مان بە دەگمەن دێتە بەرچاو بەلکو هەر بلاونەکراوەتەوە !! وا بزانم ( حەز دەکەم بە هەلەدا چووبێتم ) ئەو مافەمان هەیە بپرسین بۆچی لەو سالانەدا شیعر نەبووە ؟ ئایا رووداوەکان نەیهەژاندوونی ؟ یان هەیبووەو بۆچ بلاوی نەکردوونەتەوە ؟ ئەوەندە دەتوانم بلێم دیوانەکەی ( تاریكو روون ) کە گولبژێرێك لە شیعرەکانی ( هێمن ) ە وە لەسالی ١٩٧٤/١٣٥٣ دا کەوتۆتە بازارەوە ، وابزانم ئەم گوڵبژێرەش تارادەیەك وەلاممان دەداتەوە کە هەیبووەو هەیەتی .. وە ئەم کەم بلاوکردنەوەش لە لاینی شاعیرەوە ئەوەمان بۆ دەردەخا ، کە ( هێمن ) شاعرێکی سەنعەت کارە ، لە سالێك سێ چوار شیعر دادەنێ !!

سەرنجێك

عنوانی دوو پارچە شیعرەکەی کاك عبدالرزاق بیمارو کاك مجید نەیم کە لە ژمارە ٧٢ ی پێشوی گوفارەکەمان بلاوکراوەتەوە ، بەداخەوە بەهەلە پەریوەتە سەر یەکتر ، بۆیە داوای لێبوردن ئەکەین .

# ئەم ووشانە..



احمد کریم زامدار

نەشمیلەکەم ...
بەهاری چاوی مەستی تۆ ...
خەزانی دڵی زامدارم نەوروزێنێ و ...
ژەماوەندی خۆشی تیدا بەرپا دەکات ...
شنەی بزەی لێوەکانت ،
دەریای بیرم دەشلەقێنێ ، ..
بۆ دەست لە ملانێی شەپۆلو کەنارەکان .
تیری نیگات ...
فەرهادی خۆشەویستیەکەم .

ڕادەهاڵێت بۆ بێستونی بڕوای بتەو
بۆ کێشانی نیگاری دوو دڵداری پێك نەگەیشتو .
لەنجەی ئاسکت ...
هەستم بەرەو لوتکەی گۆنات ڕادەکێشێ .
بەلام گیانە ..
ئەم ووشانە ...
تا ئێستاکە کۆترنو لانەی خەیالم جێ ناهێلن ...
بە ئازاری لێك ئاشکرابونیانەوە دەناڵێنن ...

جەماوەری لە خۆ کۆ کردۆتەوە .. وە ئەوە یەکێکە لەو عونسورە سەرەکیانەی وای لە بەعسی کردووە کە بتوانی سەرکردایەتی شۆڕشو وڵات لە ڕێگای سەرکەوتنو پێشکەوتنو خۆشگوزەرانیو سەربەرزیدا بکات .

### ● ڕەوشتی بەعسی لە دلی میللەتەوە دەردەچێت .

ڕەوشتی بەعسی لە دلی میللەتەوە دەردەچێت . . وە لە کەلەپوری نەتەوەوە و قیەمی وەفاداریو لە خۆبوردنو ئیسارو ئامادەیی بۆ پێشکەش کردنی هەموو قوربانی یەك لەپێناوی نەتەوەدا وە لەپێناوی ئامانجە نەتەوایەتیە بەرزەکاندا تەجسید دەکات ، ئا بەم ڕەوشتەوە .. ئەی برایان .. لە ڕۆژی یەکەمەوەو بەدرێژایی یازدە سالی رابوردوو شۆڕشەکەتان ڕێ کردووە .

ئەم ڕەوشتە مۆرکێکی جیاکەرەوە بووە بۆ پەیوەندیکانی نێوان سەرکردایەتی حزبو شۆڕش لە بەرپابوونیەوە لە تەمموزی ١٩٦٨دا تا وەکو ئەمڕوکە لە گەل ئەو هەموو پیلانو ئەرکە گرانو دۆخە ناسکانەدا کە بەرەو ڕوومان هاتووە . ئەی برایان ..

ئا لەم سیفاتانەوە کە شۆڕشو حزبە سەرکردەکەی هەیەتی لەگەل پەیوەندی نێوان سەرکردایەتی ئا لەم بیرەوەریە پیرۆزەدا باسی ئەو بڕیارەتان بۆ دەکەم کە داوەمو برایانو هاوڕییانم لە سەرکردایەتیدا هاوبەشیان لەگەلدا کردووم .

وەك هاووڵاتیەکو رۆلەیەکی ئەم گەلە تێکۆشەرەو نەتەوەی عەرەبی خەباتکەر پەروەردە بووم ، بەدرێژایی ژیانم هەستم بەئازاری گەلو نەتەوەدەکرد وە هەستی پەیوەندیەکی قولم بە هیواکانیەوە دەکرد و بە ئاواتەوە بووم کە خۆم بخەمە پێناوی خزمەتی مەسەلە عادیلەکانی . .

لە لاوێتیمەوە هاوچەرخی خەباتی گەلی عیراقم کردووە لە پێناوی سەربەستیو سەربەرزیو ئامانجە نەتەوەیەکاندا کاتێ شۆڕشە نەمرەکەی لە سالی ١٩٤١دا دژی داگیرکەرانو داردەستەکانی بەرپاکرد . ئەوە بوو لەگەل برایانم ئەفسەرانی ئازاد دا شەرەفی بەشداری کردنی شۆڕشی ١٤ تەمموزی ( ١٩٥٨ )م هەبوو کە سەردەمی پاشایەتی کۆنەپرستی سەر بەئیستیعماری گۆڕ کرد بەلام تاقمێکی چەوتڕەو زۆردار دوای شۆڕش دەستی بەسەر جلەوی کارو باردا گرتو لە ڕێگای نیشتمانیو نەتەوەیی دروستی خۆی لای داو زۆرداریو پاشاگەردانیو دەروون ڕەشی بەناو هەموو عیراقدا بلاوبۆوە ، ئەوەبووگەل چەند هەفتەیەکی کەم بەسەر شۆڕشەکەیدا تیپەڕنەبوو بوو دوو چاری کوێرەوەریو ئازار بۆوە .

لەو ماوە ناسکەی مێژووی وڵاتدا و کاتی چارەنووسی عیراق مەترسی لادانی لێ دەکرا لە ڕێگای عەرەبایەتیو سەربەخۆی وە کاتی وڵات مەترسی پارچەبوونو دارمانی هەبوو .. بەشێوەیەکی بیرو باوەڕو ڕێکخستنو تێکۆشان پەیوەندی خۆم بەست بەحزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستیەوە .

### ● بەعس .. سەرکردە نەترسەکە

حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی لەو قۆناغەدا سەرکردەیەکی نەترسی خەباتی ملیونەهای رۆلەکانی گەلی عیراق بوو دژی چەوت ڕەوتیو دیکتاتۆریەت وە لەبەر پالی عەقیدەی نەتەوەییو سۆشیالیستیو لەبەر ئەو سیفاتە ئازایەتیو نەترسییە و ئامادەییە بێسنوورەی بۆ قوربانیدانو فیدەکاری لەپێناوی نیشتمانو نەتەوەدا هەیبوو بەراستی بووە پێشەنگی هەموو ڕزگاریخوازانو هەموو ئەو نەتەوەییە تێکۆشەرانەی باوەڕیان بەعەرەبایەتیو سەربلندی هەبوو . وە بەهۆی تێکۆشانی شۆڕشگێڕانەی نەبەزی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستیەوە لایەنگیری جەماوەری گەلو ئازایەتی هێزی چەکداری نیشتمانییەوە شۆڕشی ڕەمەزانی مەزن بەرپابوو کە بەراستی بوکی شۆڕشەکان بوو لە بەر پالەوانێتی بێوێنەیو نەخشەی پۆلاینیو ئامادەیی بێکۆتایی بۆ خۆ بەختکردنو گیان فیدایی .

ئەوەنەبێونۆخەیدەورەی شۆڕشەکەی دا وای کرد کە

حزب نەتوانێت هەموو پێویستی‌یەکی سەرکەوتنی بۆ ئامادە بکات .. ئەوە بوو دوچاری تەنگوچەڵمەی پرمەترسی بوو کە چەند کەسێکی رقاوی‌و چاوچنۆکی دەسەڵات بەبێ ئەوەی شایستەی بن‌و سپلە بە ئەو چاکەیەی حزب‌و شۆڕش لە گەڵیاندا کردبووی ئیستیغلالیان‌کردو پیلانیان‌کردە سەری‌و سەر حزبی ئازا کە دروستی کرد بوو ، پاشگەزی خۆیانیان لە هەژدەی تشرینی دووەمی ١٩٦٣دا بەجێ‌گەیاند جا ئەو حزبەی وایان زانی کە بەپاشگەز بوونەوەکەیان لە ناویان بردووە بەراستی ئەوەی سەلماند کە حزبێکی میژوویی‌یە نابەزێت‌و بەراستی میللت لەدەوری کرد بۆتەوە..

حزب درێژەی بەخەباتی نەبەزیوی خۆی‌دا دژی‌پاشگەز بوونەوە بلحەکە کە زۆرداری‌و تۆقاندنی بەسەر جەماوەرو تێکۆشەراندا سەپاندبوو ، فەسادی‌و تەلەکەبازی‌و دوورویی بڵاوکردبۆوە سەرلەنوێ وڵات گەڕایەوە بۆ بینینی داستانی پڕ لە قوربانیدان و جوامێری‌و ئازایەتی کە تێکۆشەرانی بەعس پێوە ناسرابوو .

دوای چەند ساڵێک لە تێکۆشانی نەبەزانە شۆڕشی ١٧ی تەمموز لە ساڵی ١٩٦٨دا بەرپابوو بۆ ئەوەی کاروبار لە عیراقدا بگێڕێتەوە جێگای شیاوی خۆی وە بۆ ئەوەی دوای چەند ساڵێک پڕی کات لەتێکۆشان‌و بنیاتنانی بنکەیەکی ڕزگاربووی مەڵبەندی پرشنگدانەوەی بزووتنەوەی شۆڕشی عەرەبی .

سەرکردایەتی حزب‌و ئەنجومەنی شۆڕش ، پاشان شۆڕش لە سەرکردایەتیدا شەرەفی پلەی یەکەمیان دامێ .. بەیارمەتی هاوڕێیانم لەسەرکردایەتی قوتری حزب و

● **بەرپرسیاری شەرەف‌و ئەرکە .**

**ئەی برایان**

خوا لە کتێبە پیرۆزەکەیدا فێری کردودین ڕەو شتی‌ڕەسەنی عەرەبایەتی‌و بیروباوەڕی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی‌و تەقالیدە دیموکراتیکانی و قیمە ڕەوشت بەرزێکانی فێری ئەوەی کردووین کە بەرپرسیاری شەرەف‌و ئەرکە نەک ئیمتیاز..

وە بەدرێژایی ژیانم ئامادەی هەموو ئەرکێک بووم کە حزب‌و سەرکردایەتی پێی سپاردبم ئەوەندەی لە توانامدا بووبێ .. ئەوە نەبێ .. ئەی برایان لەدەمێکەوە قسە لەگەڵ هاوڕێیانی سەرکردایەتیدا دەکەم بەتایبەتی هاوڕێی خۆشەویست صدام حسین دەربارەی دۆخی تەندروستیم کە ڕێگای ئەوەم نادات ئەو ئەرکانە هەڵسوڕێنم کە سەرکردایەتی شەرەفی هەڵسوڕاندنی پێ‌سپاردوم‌وداوام لێ‌دەکرد کە لەم ئەرکانە بم‌حەسێننەوە ، بەڵام ئەخلاقی بەرزی هاوڕێ صدام حسین‌و هاوڕێیان لەسەرکردایەتی ئەوەیان ڕەفز دەکرد کە باس لەو مەسەلەیەوە بکەن . وە تەعبیریان لەوە دەکرد کە ئامادەن ئەوەندەی بکرێت ئەرکەکانم لەسەرشان سووک بکەن .

هاوڕێ صدام حسین بەحوکمی جێگای خۆی‌و دەستووری‌یی لە سەرکردایەتی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش‌دا لە ماوەیەکی دوورودرێژەوە زۆر لەو ئەرکانەی هەڵگرتووم کە دەتوانرێت لە بارەی عەمەلی‌و دەستوری‌یەوە هەڵی بگرێت ..

بەڵام لەم دواییەدا تەندروستیم گەیشتە ڕادەیەک کە ناتوانم ئەرکەکانم بەو جۆرە بە ڕێوەبەرم کە ویژدان ڕەزامەند کات‌و لە گەڵ گەورەیی ئەو کارانەدا بگونجێت کە سەرکردایەتی پێی سپاردووم .. لەبەر ئەوە زۆرم لە هاوڕێ صدام حسین‌و لە هاوڕێیانم کرد لە سەرکردایەتی حزب ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشدا وە لەجێگای برایەتی‌و پەیوەندی هاوڕێیەتیەوە کە کۆمان دەکاتەوە کە بەدەنگ داواکارەکەمەوە بین بەوەی بەرپرسیاریم لابەرن لە حزب‌و دەوڵەتدا .

وە ئەمڕۆ من هەست بەئیسراحەت دەکەم چونکە هاوڕێیانم ئەم داوا کاریەیان لێ قبوڵ‌کردم .

ئەی برایان

ئەمڕۆ هەست بەدڵنیایی‌و شانازی دەکەم چونکە ئەو پلەی پێگەیشتنەی حزب‌و شۆڕش پێی‌گەیشتوە .. وە چونکە تەبیعەتی پەیوەندی لەسەرکردایەتی بەکۆمەڵدا‌و پەیوەندی قوڵی هاوڕێیەتی توانای ئەوەی پێدایین کە ئەم بڕیارە بدەین‌و دەسەڵات

بەشێوەیەکی دەستوری‌و هاوڕییانە بگوێزینەوە ‌‌·· ئەمەش ·· ئەی برایان سیفەتێکی مەزنی تری شۆڕشی تەمموزو ئەو حزبەیە کە سەرکردایەتی دەکات .

هەروەك من هەست بەدڵنیایی‌و سەربەرزیٚ دەکەم کە ڕێبازی مەزنی حزب‌و شۆڕش وکردەیەکی بەتوانای ئەوتۆیٚ ئامادە کردووە کە بتوانی بەموستەحەقی‌و تواناوە بەرپرسیاری سەرکردایەتی ڕاپەڕێنێت ·· ئەویش ئەو پیاوەیە دەنیاسن ·· برای هاوڕی صدام حسین کە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش هەڵی‌بژاردووە بۆ سەرۆکایەتی خۆی‌و سەرۆك کۆماری عیراق .

ئەی برایان ··

لەم ساتەدا کە لە مەوقیعی بەرپرسیاری رەسمی‌یەوە دووعا خوازیتان لێ‌دەکەم شانازی‌و سوپاسی قولم نیشان دەدەم بەرامبەر ئەو پشتگیری‌و باوەڕەی گەلی عیراقی کەریم بەدرێژی ئەو ماوەیە پێی بەخشیووم کە بەرپرسیاریم هەلگرتووە ··وە وە لە هەموو تێکۆشەرێك لە حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی‌دا وە لە براکانم لە هێزی چەکداری نیشمانیدا ·ئەم هەستە جوامیرانەیە بەرامبەرم ئەو ساو بەردەوام مەدالیایەکی بەرزە شانازی پێوە دەکەم وە بەدرێژایی ژیانم پێوەی دەنازم ·· بەتایبەتی سوپاس‌و شانازی پێشکەش دەکەم بەبرایان‌و هاورێیانی خۆشەو- یستم لە سەرکردایەتی حزب‌و ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشدا ئەوانەی کارم لە گەلدا کردوون لە قوناغی تێکۆشاندا پێش شۆڕش وە لە قوناغی بنیاتنانی شۆڕشگێڕیی پڕ لەکاری دلسۆزی بەوری لە خزمەتی گەل‌و نیشتماندا ·· ئەوانە چاکترین هاوڕیٚ‌و چاکترین سەرکردەبوون لە بەتەنگەوە هاتنی گەل‌و نیشتمان‌و نەتەوەکەیاندا ··وە من پیرۆزبایی لە برا هاوڕیٚ صدام حسین دەکەم بۆ ئەوەی شەرەفی بەرپرسیاری هەلگرتووە لە سەرکردایەتی حزب‌و شۆڕشدا·. هەست بە با باوەڕێکی قول دەکەم کە سەرکردایەتی بەراستی پیاوێکی شایەنی سەرکردایەتی هەلبژاردووە لە بارەی رەوشت‌و تێکۆشان‌و ئازایەتی‌و تواناوە .

● **هاوڕی صدام حسین·· تێکۆشەری ئازا**

هاوڕی صدام حسین لە سالانی تێکۆشانی سەختی بەر لە شۆڕشدا ئەو تێکۆشەرە ئازاو ئەمینە بوو کە تێکۆشەرانی حزب ڕێزیان لێ‌دەگرت‌و باوەڕیان پێیٚ هەبوو

لە بەرە بەیانی شۆڕشدا لە پێشەنگی ئەو پیاوە ئازایانە بوو کە خۆیان‌کرد بەقەلای دیکتاتۆری‌و کۆنەپەرستیدا بەدرێژایی ڕێبازی شۆڕشی ئەو سەرکردە لێهاتووە بووە کە توانای بەرەورووی ئەوەی هەمو سەختی‌و هەلگرتنی هەموو بەرپرسیاریەکی هەبووە لەبەر ئەوە جێگای خۆشەویستی‌و ڕێزی هەموو هاوڕییانی سەرکردایەتی حزب‌و ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش‌و هەموو تێکۆشەرانی حزب‌و رۆلەکانی گەل بوو ··

من باوەڕێکی نیجگار گەورەم هەیە کە ئەو گیانی هاوریٚیەتی‌و بیروباوەڕی سەرکردایەتی بە کۆمەلەی سیفەتی ڕێبازی حزب‌و شۆڕش بووە ·· وە پەیوەندی لە سەرکردایەتیدا ئەوە دەبێتە ئەو چرایەی ڕێگا لەبەردەم هاورێیاندا رۆشن دەکاتەوە لە سەرکردایەتی‌کردنی حزب‌و شۆڕشدا بۆ بەردەوام بوون لە ڕێبازی سەر بلندا بۆ خزمەتی گەل‌و نەتەوە .

ئەی برایان ··

داواخوازی سەرکەوتن بۆ هەموو رۆلەیەکی گەلی عیراقی خۆشەویست دەکەم وە لە خوادە پاڕێمەوە کە بەرەکەتی خۆی بەسەر ڕێبازی شۆڕشدا ببارێنێت‌و ·· نەتەوەی عەرەبی ئەمر لە تێکۆشانی عادیلانەی‌دا سەرخات لە پێناوی رزگاری فەلەستیندا‌و وەدی‌هێنانی ئامانجەگەورەکانی لە یەك بوون‌و سەربەستی‌و سۆشیالیستی‌دا ·

خوا سەرکەوتووتان کات‌و دروردوبەرەکەتی خواتان لە سەر بێت ·


رقم الایداع في المكتبة الوطنیة ببغداد ١١٨ لسنة ١٩٧٩

## بیروڕای سەربەست

### [ سەرچاوەی ڕۆشن ]

کە ئاوە شلەقاوو لیخنەکان هێمن ئەبنەوە ڕووناکی خۆر تاکو بن ئاوەکە ئەڕوات ، ڕۆشنایی بە گشت بەردو دارو گیانەوەری ناو ئاوەکەدا ، ئەوکاتە تۆ ئەتوانیت بێ ترسی بە ناو ئاوەکەدا بڕۆیتو بزانیت پێ بە چیدا ئەنێیت .

دەروونی مرۆڤ وەك سەرچاوەکانی ژێر زەویە کە بە بن شاخو کیودا دەڕوات ناتوانی بە ئاسانی ناوئاخنی ببینی یاخود هەستی پێ بکەی باوەکوو کە لێنێکی تێ نەکەیتو بچێتە ژوورەوەی .

دەروونی منال سەرچاوەیەکی پاکژی بێگەردە بەلاّم ئەشلەقێتو تێك ئەچێت ، ئەگەر دووچاری بومە ـ لەرزەی ژیان بیێت .

نهێنی دەروونی منالو کلیلی گەنجینەی پرسامانی لەلای باوانیەتی ، بۆیە ئەلێین هەر ئەوان ئەتوانن بە ناخی تولی دەروونیدا شۆڕببنەوەو سەرچاوە شلەقاوەکانی هێمن بکەنەوەو وردە زیخەکانی کە لە بنیدا نیشتوون ببینن . ئالوزیو ژاکاوی دەروونی منال دەیەها هوی تایبەتیی هەیە .

گەورەترینو گرنگ ترین سەرچاوەی ژیانی منال دایكو باوکیەتی هەچ ئالوزیەك لە نێوانیاندا هەبێت بێ گومانو بێ ئەوەی هەستی پێ بکات ئالوزی ئەهاوێژێتە دەروونیەوە ، لە ئەنجامدا ئەبێتە ڕەوتێکی ژیانی دواروژی وچارەسەرکردنی ئاسان نیە .

ژیانی بەختەوەریی نێوان خێزان وێنەی ئازادیو کامەرانی بۆ منال ئەسازێنێ ، خۆ ئەگەر بێتوو یەکێکیان بەهەر جۆرێك لە چاو وون بوو ئەوا پەردەی ڕەشی بەسەرلاپەڕە سپیەکانی ژیانیدا ئەکشێو هەتاهەتایە ئەو پەڕە ڕۆشنانەی ژیانی ڕووناکییان تێناکەوێ .

کەوابێ پێش ئەوەی سروشتی ژیان خۆی لەخۆیدا منال لە یەکێك لە سەرچاوەکانی ژیانی بێبەش بکات نابێ دایكو باوك لە سەرچاوەی خۆشەویستیو بەختیاریوو ژیانی خێزانی یەکگرتوو بێ بەش بکەن ، تا ماون لەگەل یەك خۆ بەخت کردن لە پیناوی پێگەیشتنو پەروەردەکردنی ڕۆلەکانیاندا بکەنە سەرچاوەی مەبەستو ئاواتیان ، تاکوو سەرچاوەی ژیانی ـ

منالەکانیان ڕۆشن بێتو تاریکیو سامناکی ژیانی ڕابووردووی خۆیان بێتە هۆی هەولو تەقەلایەکی زانستیانە بۆ پاراستنی دەروونە بێ خالەکانیان .

نجاة رفیق حلمی


المشرف العام
سعاد اديب علي
نائب رئيس التحرير
فائق جميل علي

نرخی ٥٠ فلسە
ئەم ژمارەیە ١٠٠٠٠ دانەیلێ چاپکراوە
مطبعة الزمان ـ بغداد

